# سیستەمی ویندۆس ٩٨



زنجیرەی زانستەکانی کۆمپیوتەر




چاپی دووەم

## سەرەتایی پێشکەوتوو پێگەیشتوو




هەنگاو بە هەنگاو تا پێگەیشتن

ئامادەکردنی : ئاراس حاجی مەولود

ئەم کتێبە ( ١٠ ) وانەی لە خۆ گرتووە:

- کردارە سەرەکیەکان.
- پەنجەرەکانی ویندۆس و شریتی ناونیشان.
- لیست و چوار گۆشەی هەڵبژاردە.
- شریتی مەهام و تایبەتمەندیەکانی.
- لیستی ستارت.
- بەڕێوەبردنی فایلەکان.
- پاراستنی ئامێرەکە.
- گۆشەی زانیاریەکان.
- ئامێری چاپ کردن.
- بەشەکانی ACCECSSORIES

# Microsoft Windows98

ژمارەی سپاردن ( ٧٧ ) ساڵی ٢٠٠٢

چاپ: چاپخانەی نازە

**مەبەست لە زنجیرەی زانستەکانی کۆمپیوتەر:**

١- ئاشناکردنی خەڵکی کوردستان وەك گەلانی تری پێشکەوتووی دنیا بە زانست و بواری جیاجیای کۆمپیوتەر و بەکارهێنانی بۆ خزمەتی ئاین و گەل و نیشتمان.

٢- ئاسانکاریی و زەمینەسازی بۆ تاکی خوێندەواری کۆمەڵگەی کوردی بە مەبەستی فێربوونی کردەیی کۆمپیوتەر و سیستەمەکانی.

٣- بەهرەمەند بوون لە بەخشش و سودە جیاجیاکانی بواری کۆمپیوتەر و بەکارخستنی لەبەرەوپێش بردنی کۆمەڵگەدا.

٤- دەوڵەمەندکردنی کتێبخانەی کوردی و خزمەتکردن بەزمانی کوردی لەم بوارەدا.

**نووسینگەی تەفسیر**

**هەولێر**

# سیستەمی ویندۆس

# ٩٨

## سەرەتایی پێشکەوتوو پێگەیشتوو

ئامادەکردنی : ئاراس حاجی مەولود

لە بڵاوکراوەکانی نووسینگەی تەفسیر هەولێر

ناوی کتێب: سیستەمی ویندۆس ٩٨
ئامادەکردنی: ئاراس حاجی مولود
کۆمپیوتەر: مەڵبەندی کۆمپیوتەری ئاراس
تایتلی بەرگ: نەوزاد کۆیی
چاپ و بڵاوکردنەوەی: نووسینگەی تەفسیر/ هەولێر
ژمارەو ساڵی چاپ: چاپی دووەم ٢٠٠٢
چاپکردن: چاپخانەی تازە
تیراژ: ١٥٠٠ دانە
ژمارەی سپاردن: (٣٧٩) ساڵی ٢٠٠٢

تەفسیر
هەولێر - شەقامی دادگا
ت: ٢٢٢١٦٩٥_٢٢٣٠٩٠٨
tafseeroffice@maktoob.com
AlTafseer@hotmail.com

# پێشکەش

- پێشکەشە بە هەموو ئەو کەسانەی کە خزمەت بە زانست و ئەدەبی کوردی ئەکەن .
- پێشکەشە بە ئەو خۆشەویستانەی هاندەرم بوون بـۆ بـە چاپ گەیاندنی ئەم کتێبە .
- پێشکەشە بە ئەو خوێنەرە خۆشەویستانەی بـە دوای زانسـتی نوێ دا دەگەڕێن .
- پێشکەشە بە هەموو ئەو هـاوڕێ بەڕێزانـەی کـە یارمـەتیان داوم .

ئاراس مەولود

مەڵبەندی کۆمپیوتەری ئاراس

# بسم الله الرحمن الرحيم

# پێشەکی

برای خوێنەری خۆشەویست.. بێگومان لە ڕۆژگاری ئەمڕۆمان ڕۆژانە هەست بەو پێشکەوتنە جۆراوجۆرانەی دەورویەرمان دەکەین، ئەوەی گومانی تێدا نیە ئەوەیە هەموو پێشکەوتنێك ماندووبونی دەوێ. وەکو لای هەموان ئاشکرایە زانستی کۆمپیوتەریش ئەمڕۆکە زانستێکی گرنگە، کە دەتوانم بڵێم فێربوونی ئەم زانستە زەرورەتێکی ژیانی ئەمڕۆمانە ، کۆمپیوتەر ئەو ئامێرە زیرەکەیە کە دەتوانین لە هەموو بوارەکانی ژیانمان دا سوودی لێ وەربگرین و بۆ هەموو کارو بارەکانمان بە کاری بینین.

من بەش بە حاڵی خۆم سوپاسی و ستایشی خـــــودا دەکەم کە توانیم ئەم کتێبە ئامادە بکەم و وەك پرۆژەیەك پێشکەشی سەرپەرشتیارانی نووسینگەی تەفسیری بکەم، ئەوانیش-خوا پاداشتیان بداتەوە- پێشوازیان لێ کردم و ئەرکی چاپ و بڵاوکردنەوەیان گرتە ئەستۆ و بڕیاریان دا کە ئەم کتێبە ببێتە دەستپێکی زنجیرەیەك کتێبی تایبەت بە زانستەکانی کۆمپیۆتەر.

ڕەنگە ئەم کتێبە هەندێ کەم و کوڕی هەبێت، بۆیە داوای لێبوردن لە خوێنەران دەکەین، چونکە ئەمە یەکەم بەرهەمە و بە پشتیوانی خودای گەورە هەوڵ دەدەین خزمەتی زیاتر بەو خۆشەویستانە بکەین کە بە دوای زانستی کۆمپیوتەردا دەگەڕێن و، لە داهاتوودا دەست دەکەین بە ئامادەکردنی چەند کتێبێك دەربارەی هەندێك لە بەرنامە گرنگەکانی کۆمپیوتەر، بەو ئومێدەی خودای گەورە یارمەتی دەرمان بێت و، خوێنەرانی بەڕێزیش هاندەرمان بن.

**ئاراس**

**٢٠٠٢/٣/٥**

# پێڕست

# سەرەتاییک بو ناسینی پارچەکانی کۆمپیوتەر

١- مونیتەر MONITOR

٢- کیبورد KEYBOARD

٣- ماوس MOUSE

٤- کەیس

ناوەرۆکی کەیس لەم بەشانە پێک هاتوە :

أ- مەزەربۆرد واتا بەشی دایک هەموو پارچەکانی تر لەسەر ئەم بەشە دەبەسترێن

ب- پرۆسستر واتا خێرایی کۆمپیوتەرەکە

ت- رام واتا خێرایی بیرکردنەوە

پ- هارد واتا ئەو بەشەی کە هەموو پرۆگرامەکانی لە ناودا خەزن دەکرێ

ج- فلوپی دێسک واتا ئەو بەشەی کە دێسک دەخوینیتەوە

ح- پاوەر واتا ئەو بەشەی کە کارەبا دەگەیێنێت بە ئامێرەکە

خ- فان واتا پانکە

مالتی میدیا MULTI MEDIA لەم بەشانە پێک دێت :

١- ساوەند کارت واتا کارتی دەنگ

٢- سی دی روم واتا ئەو بەشەی کە سی دی دەخوێنێتەوە

٣- سپیکەر واتا سەماعە

# وانەی یەكەم
# كردارە سەرەكیەكان

## ١- ماوس

چۆنێتی بە كارهێنانی ماوس

## ٢- روبەری شاشە

روبەری شاشە چی لەسەردایە و كاریان چیە

## ٣- سەرەتای چونە ناو بەرنامەكان

سەرەتای چونە ناو بەرنامەكان لە كوێوە دەبێت

## ٤- اقراص و فایلە سەرەكیەكان

٤ - اقراص و فایلە سەرەكیەكان لە كوێ دەبینین و كاریان چیە

## ٥- چۆنێتی كۆتایی هێنان بە ویندۆس

٥- چۆنێتی كۆتایی هێنان بە ویندۆس و كوژاندنەوەی ئامێرەكە

## ١- ماوس Mouse

چۆنیتی بەکارهێنانی ماوس سەرەتا دەبێ گرنگیەکی زور بدەین بە ماوس چونکە زوربەی کارەکانمان لە ڕێگای ماوسەوە دەبێت. وە بۆ ئەوەی بتوانین بەشێوەیکی ئاسایی مامەڵەی لە گەڵدا بکەین دەبێت بە دوای ئەم خاڵانەدا بڕوین :



Mouse

١




Mouse

ماوس لە دوو دوگمەی سەرەکی پێك هاتوە کە دەکەوێتە بەشی سەرەوەی ماوسەکە وە ئەو دوو دوگمەیە دەکەونە لای راست و چەپی ماوسەکە کە کلیکی لای راست بۆ یەك جار کلیك بەکاردێ و کلیکی لای چەپ لە زۆر کاتدا بۆ دووجار بە کاردێ.

تێبینی : دەتوانی لە جیاتی ووشەی دوگمە ( کلیک ) بەکار بێنی.
لە هەندێ ماوسدا سێ دوگمە هەیە بەڵام هەر کلیکی لای راست و کلیکی لای چەپ کاری پێ دەکرێ .

٢



بۆ بەکارهێنانی ماوس دەبێ ئاراستەی ماوسەکە ببەینە سەر ئەو بەشەی کە دەمانەوێ بیکەینەوە وە بە کلیکی لای چەپ دووجار لە سەر یەك واتا(دەبل کلیك) دەکەین لەسەر شێوەی فایلەکە بۆ کردنەوەی وە دەتوانی کلیکی لای راست بە کار بێنی بەڵام لەم بەشدا یەك جار کلیك دەکەیت تا لیستێك دەردەکەوێ دەتوانی لەو لیستەدا ئەو فەرمانەی بتەوێ هەڵبژێری .

## ٢- ڕووبەری شاشە Desktop

سەرەتای پێکردنی ئامێرەکە دەبینین دوای پێداچوونەوەی سیستەمی Ms.dos و سیستەمی Windows دەبینین ڕووبەری شاشەمان بۆ دەردەکەوێ کە سێ بەشی سەرەکی لەسەردایە کە ئەوانیش لەم بەشانەی خوارەوە باسیان دەکەین



١



**My Computer**

ئەم بەشە تایبەتە بە هەموو ئەو قرص و فایلانەی ناو کۆمپیوتەرەکە کە دەتوانی لە ڕێگای ئەم بەشەوە بچینە سەر ئەو قرص و فایلانەی کە دەتەوێ کاری لەسەر بکەیت، واتا بە شێوەیێکی گشتی هەموو ئەقراصەکان و بەرنامەکان و فایلەکانی ویندۆس لە ناو ئەم بەشەدان .

٢



**Recyclebin**

کاری ئەم بەشە تایبەتە بەو فایلانەی کە لە ناو هاردەکە دا ( Delete) دەکەیت هەر کاتێك و لە هەر بەشێکی ویندۆس یان ئۆفیس بەرنامەیەك یان فایلێك ( Delete ) بکەیت ئەوە بەشێوەیێکی ڕاستەوخۆ دەچێتە ناو ئەم بەشەوە وە لێرە شەوە دەتوانی لە ناو ئامێرەکە دا (Delete) بکەی تا بەشێوەیێکی یەکجاری لە ناو هارد دا نەمێنی .

٣



**My Documents**

کاری ئەم بەشە تایبەتە بە فایلی خەزن کراو واتا هەر کاتێك لاپەرەیێك یان فایلێك حفظ بکەیت لەناو هەر بەرنامەیەك لە بەرنامەکانی ئۆفیس ئەوە لە دوای حفظ کردن بە شێوەیەکی ڕاستە و خۆ دەچێتە ناو ئەم بەشەوە وە بۆ کردنەوەی ئەو بەشە خەزن کراوە دەتوانی بچیتە سەر ئەم بەشە وە لەوێ بیکەیتەوە .

## ٣- سەرەتای چونە ناو بەرنامەکان Start




سەرەتا دوو ڕێگامان هەیە بۆچونە ناو بەرنامەکان لەم بەشەدا باسی هەردوو ڕێگا دەکەین وە زیاتر تیشک دەخەینە سەر شێوە ئاسانەکە بۆ ئەوەی بتوانین زیاتر مامڵە لەگەڵ شێوە ئاسانەکە بکەین دەبێ بە دوای ئەم خاڵانەدا بڕۆین:

١



دوای پێ کردنی ئامێرەکە وە دوای ئەوەی کە دێینە سەر ڕووبەری شاشە پێویستە بزانین لە گویوە بچینە سەر ئەو بەرنامانەی کە دەمانەوێ کاریان لە سەر بکەین ئەوە دەتوانین بێنە سەر بەشی خوارەوەی شاشە وە لەوێ ئاراستەی ماوسەکە ببەینە سەر قائمەی ستارت ( Start ) کە لەسەر شریتی مهام دایە وە لەوی یەکجار کلیکی لای چەپ دەکەین لە سەر شێوەکە دەبینین لیستێکمان بۆ دەردەکەوێ .

٢



دوای دەرکەوتنی لیستەکە دەبینین چەند هەڵبژاردەیێکی تیدایە وە لەو هەڵبژاردانە ئێمە دەچینە سەر پروگرام ( Program ) وە ئاراستەی ماوسەکە لە سەر ئەم بەشە رادەگرین دەبینین کە لیستیکمان بۆ دەردەکەوێ دەبینین کە هەموو ئەو بەرنامانەی کە خۆمان لە ناو هاردەکە هەمانە لە ناو ئەم لیستەش دا هەن دەتوانین بۆ ئیش پێ کردنی ئەو بەرنامانە ئاراستەی ماوسەکە ببەینە سەر شێوەی ئەو بەرنامەیەی کە دەمانەوێ بیکەینەوە وە لەوێ یەك جار کلیکی لای چەپ دەکەین بۆکردنەوەی.

## سەرەتای چونە ناو بەرنامەکان

٣



ڕێگـــای دووەم بـــۆ چونـــە نـــاو بەرنامەکانـــەوە بـەم شـێوەیە دەبێـت سـەرەتا ئاراسـتەی ماوسـەکە دەبەینـە سـەر ئـایکونی My Computer وە لەوێ ( دبل کلیـك ) دوو جـار کلیکی لای چەپ دەکەین بۆ کردنەوەی .

٤




دوای کردنەوەی My Computer دەبینـین ئەم شێوەیەمان بۆ دەردەکەوێ ئێمـە لـە نـاو شێوەکەدا قرصی [ C: ] هەڵدەبژێرین کە بـە بەشـی هـارد ناسـراوە وە بـــە ( دبـل کلیـك ) دەیکەینەوە دەبینین کە شێوەیێکی ترمان بـۆ دەر ئەکەوێ لەو شێوەیەدا ئـەم هەنگاوانـە بـە کار دێنین .

٥




دوای کردنەوەی قرصی [ C: ] دەبینـین کـە ئەم شێوەیەمان بۆ دەر ئەکـەوێ ئێمـە لێرەدا دەتوانین بچینە سەر Program File وەلـەوی بە ( دبـل کلیـك ) بیکەینـەوە دەبینـین کـە شێوەییکی ترمان بۆ دەر ئەکـەوێ کـە لـە نـاو ئەو شێوەیەدا هەموو ئەو بەرنامانەی تێدایە کە هەمانە وە دەتوانین بۆ کردنەوەی هەر یەك لەو بەرنامانـەی کـە بمانـەوێ بیکەینـــەوە بـــە ( دبل کلیك ) بۆ کردنەوە بە کار بێنین .

# My Computer -٤

## اقراص و فایله سەرەکیەکان لە کوێ دەبینین وکاریان چیە؟



بۆ ئەوەی بتوانین ئەو قرص و فایلە سەرەکیانەی ویندۆس ببینین وە کاریان لەسەر بکەین دەبێ بە دوای ئەم چەند خاڵەدا بڕۆین وە هەر یەک لەو بەشانە باسێکی تایبەتی خۆی هەیە کەئێمە یەک یەک باسیان دەکەین وە سەرەتا دەچینە سەر My Computer وە بە (دبل کلیک) دەیکەینەوە .

١



دوای کردنەوەی My Computer ئەم شێوەیەمان بۆ دەر ئەکەوێ کە لەو پێنج بەشە سەرەکیە پێک هاتووە
١- (3.5 Floopy) ٢- (CDDraiv)
٣- قرص ( [C :] )
٤- (ControlPanel) ٥- (Printers)
هەر یەك لە مانە كارێكی تایبەتی خوی هەیە كە بەو شێوەیەیە:

٢



١- 3.5 Floopy (A: )

کاری ئەم بەشە خوێندنەوەی ئەو دێسکەیە کە دەیخەینە ناو شوێنی تایبەتی دێسك لە ناو کەیسەکەدا کە ئەویش بەو شێوەیە دەتوانین دیسکێك بخوێنینەوە سەرەتا دێسکەکە دەخەینە ناو شوێنی تایبەتی خوی وە ئنجا دێنە سەر My Computer بە (دبل کلیك) دەیکەینەوە ئنجا ئەم شێوەیەمان بۆ دەر ئەچێت ئێمە لە ناو ئەم شێوەیەدا 3.5 Floopy هەڵدەبژێرین وە بە (دبل کلیك) دەیکەینەوە، دوای کردنەوە ناوەرۆکی دیسکەکەمان بۆ دەردەکەوێ .

٣




CD ( D: ) -٢

کاری ئەم بەشە خویندنەوەی ئەو CD یە کە دەیخەینە ناو شوێنی تایبەتی CD لە ناو کەیسەکەدا کە ئەویش بەو شێوەیە دەتوانین CD یەکە بخوینینەوە سەرەتا CD یەکەدەخەینە ناو شوێنی تایبەتی خوی وە ئنجا دێنە سەر My Computer بە ( دبل کلیک ) دەیکەینەوە ئنجا ئەم شێوەیەمان بۆ دەر ئەچێت ئێمە لە ناو ئەم شێوەیەدا ( D: ) CD هەڵدەبژێرین وە بە ( دبل کلیک) دەیکەینەوە دوای کردنەوە ناوەرۆکی CDیەکەمان بۆ دەردەکەوێ .

( C: ) -٣

کاری ئەم بەشە تایبەتە بەو سیستەم و بەرنامانەی کە لە ناو کۆمپیوتەرەکە دا خەزن دەکرێن چا خەزنەکە چ لە رێگای CDیەوە بێت یان لە رێگای دێسکەوە ئەوە فەرق ناکات گرنگ ئەوەیە کە دوای تەواو بوونی خەزن کردنی هەر بەرنامەیەك دەبینین ئەو بەرنامەیە راستەو خو دەچێتە ناو ئەم بەشەوە وە لەوێ بە شێوەیێکی یەکجاری دەمینێتەوە وە بۆ کردنەوەیان دەتوانین بێنە سەر ئەم بەشە وە لەوێ کاریان لە سەر بکەین .

٤



## Control Panel -٤

کاری ئەم بەشە تایبەتە بە هەموو ئەو بەشانەی کە ویندوسی لێ پێک هاتوە کە لە ڕێگای **Control Panel** دەتوانی بچیتە ناو بەشەکانی ویندوس وە لەوێ دەستکاریان بکەیت، بۆ نمونە ناساندنی دەنگ بە ئامێرەکە یان ناساندنی شاشە بە ئامێرەکە یان هێنانی خەتێکی تازە بۆ ناو سیستەمەکە یان گۆڕینی شێوەی ڕوبەری شاشە، ئەوا دەتوانین ئەم کارانە لە ڕێگای ئەم بەشەوە ئەنجام بدەین

٥




**تێبینی : وانەیەکی تایبەتیمان لە سەر ئەم بەشە هەیە کە لەوێ بە تەواوی باسی زۆربەی بەشەکانی دەکەین وانەی ( ٨ )**

٦




## Printers -٥

کاری ئەم بەشە تایبەتە بە طابعە وبەشەکانی کە لەم بەشەدا دەتوانین طابعەیەک بە ئامێرەکە بناسێنین وە بزانین کە تایبەتمەندیەکانی طابعەکە چیە وە هەروەها هەندی شتی تری تێدایە کە لە وانەیێکی تایبەتی دا بە وردی باسەی دەکەین .

**وانەی ( ٩ ) تایبەتە بە باس کردنی ئەم بەشە**

# Shut Down -٥

**چۆنیەتی کۆتایی هێنان بە ویندۆس وە کوژانەوەی ئامێرەکە**

**بۆ ئەوەی بتوانین بە شێوەیێکی گونجاو ئامێرەکە بکوژێنینەوە بێ ئەوەی هیچ زەرەر بە بەرنامەکان بگات دەبێ ئەم چەند خاڵە ،بەچاو بکەین**

١



سەرەتا دەبێ هەموو ئەو بەرنامانەی کە لەبەر دەستتدایە یان لەسەر رووبەری شاشەدان دایان بخەیت، ئنجا دەچیتە سەر قائمەی Start وە لەوێ یەکجار کلیکی لای چەپ دەکەیت لیستێکت بۆ دەر ئەکەوێت لەو لیستەدا هەڵبژاردەی Shut Down هەڵدەبژێری و یەکجار کلیکی لای چەپ دەکەیت بۆ کردنەوەی.

٢



دوای کلیك کردن لەسەر Shut Down دەبینین شێوەیێکی ترمان بۆ دەردەکەوێت لەو شێوەیەدا سێ هەڵبژاردەی تێدایە بۆ کوژانەوە Shut Down هەڵبژێرە وە بۆ سەر لە نوێ ئیش پێ کردنەوە Restart هەڵبژێرە وە بۆچوونە ناو MS.DOS لە دوای Restart کردنەوە Restart In Ms.Dos هەڵبژێرە وە یەکجار کلیکی لای چەپ بکە لە سەر یەکێك لەو شێوانە .

٣

it is now safe to turrn off your computer

**دوای کلیك کردن لەسەر Shut Down هەندێك چاوەری دەکەین تاکو ئەم شێوەیەمان بۆ دەر ئەکەوێت دوای دەرکەوتنی ئەم شێوەیەئنجا دەتوانیت ئامێرەکە بکوژێنیتەوە بە بێ ئەوەی زەرەر بە بەرنامەکان بگات .**

# وانەی دووەم

## پەنجەرەکانی ویندوس و شریتی ناونیشان

### ١- کردنەوەی فایلەکان

چۆنێتی کردنەوەی فایلەکانی ویندوس

### ٢- بزر کردنی کاتی لە سەر شاشە

چۆنێتی بزر کردنی فایلەکان بە شێوەیکی کاتی لەسەر روبەری شاشە

### ٣- گەورە کردنی پە نجەرەکانی ویندۆس

چۆنێتی گەورە کردنی پەنجەرەکانی ویندوس

### ٤- داخستنی پە نجەرەکانی ویندۆس

چۆنێتی داخستنی مەلەفەکان

### ٥- ریکخستنی پە نجەرەکانی ویندوس

ریکخستنی شێوەی پەنجەرەکانی ویندوس

### ٦- شریتی هاتوچۆ

شریتی هاتوچۆ لە کوێیە وە کاری چیە؟

### ٧- شریتی مهام

شریتی مهام لە کوێیە وە کاری چیە؟

# ١- كردنەوەی فایلەكان

سەرەتا لەم وانەیە دا دەبێ بزانین كە پەنجەرە بە مانای چی دێت لە ویندوس بۆ زانینی سەیری ئەم شێوەیە بكە ئەم شێوەیە پێی دەوترێ پەنجەرەی ویندوس وە كاری ئەوەیە كە هەر پەنجەرێك كۆمەڵێ شریت و فایلی و فەرمانی تێدایە كە ئێمە لەم وانەیەدا باسیان دەكەین.




سەرەتا بۆ كردنەوەی هەر فایلێك دەتوانی دوو شێوە بە كار بێنی شێوەی یەكەم سهمی ماوسەكە ببە سەر شێوەی ئەو فایلە یان ئەو ئایكونەیەی كە دەتەوێ بیكەیتەوە وە لە سەر شێوەكە دوو جار كلێكی لای چەپ ( دبل كلیك ) بكە بۆ كردنەوەی فایلەكە یان ئایكونەكە یان یەكجاركلیكی لای راست بكە تا لیستیكت بۆ دەر ئەكەوێت لەو لیستە دا فەرمانی Open هەڵبژێرە وە بە كلیكی لای چەپ یەك جار كلیك بكە بۆ كردنەوەی .

١



٢



شێوەی دووەم بۆ كردنەوەی فایل یان ئایكونە دەتوانین بە هۆی كیبورد ئەم كارە ئەنجام بدەین بەم شێوەیە دەچینە سەر شێوەی فایلەكە وە یەكجار كلیكی لای چەپ دەكەین بۆ تأشیر كردنی ئنجا دێنە سەر كیبورد وە لەوێ دوگمەی Enter دادەگرین بۆ كردنەوەی فایلەكە .

# ٢- بزرکردنی کاتی له سەر شاشه

سەرەتا پێش ئەوەی بچینه سەر باسی بزرکردنی کاتی باسی شریتی ناونیشان دەکەین:

شریتی ناونیشان ئەو شریتەیە کە لە بەشی سەرەوەی هەر پەنجەریکی ویندوس دا هەیە وە ناونیشانی ئەو فایلەی لەسەر نوسراوە کە تۆ دەیکەیتەوە. واتا تۆ هەر فایلیک بکەیتەوە ئەوە ئەو دەبینی ناوەکەی لەسەر ئەو شریتە دەنوسری.



١



سەرەتا بۆ ئەوەی بتوانین فایلێك بە شێوەییکی کاتی بزر بکەین لە سەر رویەری شاشه دەبێ هەندی فایل بکەینەوە وە لە کاتی کردنەوەی فایلەکاندا دەبینین کە فایلیك فایلیکی تر بزر دەکات بۆ ئەوەی بتوانین ئەو فایله ببینین کە کەوتوتە ژێر ئەو فایلەی دووەم جار کراوەتەوە دەچینه سەر ئەو فایلەی کە دووەم جارکراوەتەوەوە لەوێ لە بەشی سەرەوەی فایلەکە وە دە چینه سەر لای راستی شریتی

٢



ناونیشانەوە کە لەوێ دەبینین سێ شێوەمان هەیە لەو شیوانە ئێمە دەچینه سەر ئەم شێوەیە هەڵدەبژێرین کە لە وێنەکە ئاماژەمان بۆی کردوە وە یەك جار کلیکی لای چەپ لەسەر ئەم شێوەیە دەکەین دەبینین کە ئەو فایلەی لە سەرەوە بوو ئێستا چوتە خوارەوە وە تەنها ئەو فایلەی لێ ماوە کە ئێمە ئەمانەوێ کاری لە سەر بکەین وە ئەگەر ویستت ئەو فایله بگەڕێنیتەوە بۆ شوێنی خوی ئەوە ئەو فایله لە بەشی خوارەوە لە سەر شریتی مهام دا هەیە یەك جار کلیکی لای چەپ بکە بۆ گەڕانەوەی .

# ٢- گەورە كردنی پەنجەرەكانی ویندۆس

كاری ئەم بەشە تایبەتە بە گەورە كردنی پەنجەرەكانی ویندوس كە بە شێوەیێك گەورەی دەكات تا هەموو ئەو فایلانە ببینی كە لە ناو پەنجەرەكان دا هەن وە ئەو كارە بەم شێوەییە ئەنجام دەدەین .



سەرەتا دەچینە سەر فایلێك وە دووجار كلیكی لای چەپ دەكەین( دەبل كلیك ) بۆ كردنەوەی ئنجا دوای كردنەوە ئەگەر هەموو فایلەكانمان لێ دیار نەبوو دەتوانین ئەو پەنجەرەیە گەورە بكەین بۆ ئەوەی هەموو فایلەكان ببینین دەچینە سەر شریتی ناونیشان وە لەوێ لە سەر ئەمشیوەیە كلیك دەكەین كە شێوەیكی چوار گۆشەی بچوكە دەبینین پەنجەرەكەمان بۆ یەك بە شاشە گەورە دەكات وە بۆ بچوك كردنی فایلەكە یان گەرانەوە بۆ شێوەی جاران لەسەر هەمان شێوە كلیك دەكەین بۆ بچوك كردن یان گەرانەوە بۆ شێوەی پێشوو .

١



بۆ گەورە كردنی پەنجەرەكانی ویندۆس دەتوانین ئم شێوەیەش بە كاربێنین بە هەمان شێوەی جاری پێشوو فایلێك دەكەینەوە وە دەچێنە سەر شریتی ناونیشان وە لەوێ دەچینە ناوەراستی شریتەكە وە دوو جار كلیكی لای چەپ ( دبل كلیك ) دەكەین لە سەر شێوەی ناوراستی شریتەكە دەبینین بە هەمان شێوەی جاری پێشوو پەنجەرەكەمان بۆ گەورە دەكات، بۆ بچوك كردنەوە دەتوانین هەمان كرداریكەین وە دبل كلیك بكەین لە سەر ناوەراستی شریتەكە بۆ بچوك كردنەوە .

٢



## ٤-داخستنی پەنجەرەکانی ویندۆس



کاری ئەم بەشەیان تایبەتە بە داخستنی پەنجەرەکانی ویندۆس دوای ئەوەی کە کارمان بە فایلێک ئەما دەبێ دایبخەین وە ئەم کارەش ئێمە لەم بەشە دا باسی دەکەین بەو شێوەیە .

١



سەرەتا بۆ داخستنی پەنجەرەکانی ویندۆس لە دوای کار تواوبوون دەتوانین بچینە سەر شریتی ناونیشان ولەوێ لە سەر ئەم شێوەیە X یەك جار کلیکی لای چەپ دەکەین دەبینین کە ئەو پەنجەرەیەی لەبەر دەستمان دایە دایدەخات وە بەو شێوەیە دەتوانین هەموو پەنجەرەکانی ویندوس دابخەین .

٢



دەتوانین هەمان کاری پێشوو ئەنجام بدەین بۆ داخستنی پەنجەرەکانی ویندۆس بەڵام بە شێوەیکی تر وە ئەم شێوەیە هەر لە سەر شریتی ناونیشان دایە لە لای چەپی شریتە شێوەیی فایلە کە دەبینین دەتوانین بچێنە سەر شێوەکە وە دوو جار کلیکی لای چەپ ( دبل کلیك ) دەکەین لە سەر شێوەی فایلەکە بۆ داخستنی پەنجەرەکە .

## ٥-ریکخستنی پەنجەرەکانی ویندۆس

کاری ئەم بەشە تایبەتە بە ریکخستنی شێوەی پەنجەرەکانی ویندۆس کە لەم بەشەدا باسی چۆنێتی رێکخستنەکە دەکەین .



١



دوای کردنەوەی فایلێك دەبینین کە شێوەی پەنجەرەی ویندۆسمان بۆ دێتە سەر روبەری شاشە ئێمە دەتوانین ئەو شێوەیە دەستکاری بکەین وە شێوەکەی بگۆرین بەو شێوەیەی کە خۆمان مەبستمانە سەرەتا دەچینە سەر یەکێك لە لایەکانی پەنجەرەکە وەکوو لە شێوەکە دا دیارە وە سهمی ماوسەکە لەسەر یەکێك لە لایەکانی رادەگرین دەبینین کە سهمی ماوسەکە دەبێت بە دوو بەشەوە .

کاتێ کە سهمی ماوسەکە بوو بە دوو بەشەوە یەکجار کلیکی لای چەپ دەکەین وە کلیکەکە بەر نادەین وە شێوەکە رادەکێشین تا بەو شێوەیەی لێ دەکەین.کە خۆمان مەبستمانە کاتێ کە شێوەکەمان ریکخست دەتوانین کلیکەکە بەر بدەین دەبینین کە پەنجەرەکەمان بەو شێوەیەی لێهاتووە کە خۆمان مەبەستمان بوو ئنجا دەتوانی بە هەر چوار لا دا ئەو کارە ئەنجام بدەی بۆ رێکخستنی پەنجەرەکانی ویندۆس .

٢



# ٦- شریتی هاتوچۆ



کاری ئەم بەشە تایبەتە بە شریتی هاتوچۆ کە بە هۆی ئەم شریتەوە دەتوانی هەموو فایلاتەکانی ناو پەنجەرەکە ببینی وە ئەم کارەش بەم شێوەیە ئەنجام دەدرێت :

١




سەرەتا دوای کردنەوەی ئایکونەیێك دەبینین کە پەنجەرێکی ویندوسمان بۆ دیتە سەر رووبەری شاشە لەو پەنجەرەیە دا ئەگەر فایلاتێکی زۆری تێدا بوو وە ئێمە هەموو ئەو فایلاتەمان لێ دیار نەبوو ئەو دەتوانین بە هۆی شریتی هاتوچۆ هەموو ئەو فایلاتە ببینین کە لە ناو پەنجەرەکەدا هەن بەم شێوەیە .

٢




بۆ بینینی فایلەکانی ناو پەنجەرەکە دەبینین لەم شێوەیەدا دوو شریت هەن کە دەکەونە لای راستی پەنجەرەکە ولای خوارەوەی پەنجەرەکە ئێمە بە هۆی ئەم دوو شریتەوە دەتوانین سهمی ماوسەکە ببەینە سەر سهمی شریتەکە وە لەوێ کلیکی لای چەپ دەکەی لەسەر سهمی شریتەکە بۆ ئەوەی کە بچێتە سەر فایلەکانی تری ناو پەنجەرەکە .

# ٧- شریتی مهام



کاری ئەم بەشە تایبەتە بە بەو شریتەی کە ناوی فایلەکانی لەسەر دا دەنوسریت وە ئەم شریتە دەکەویتە بەشی خوارەوەی شاشە وە پێی دەوترێ شریتی مهام .

١

سەرەتا کاتێ کە فایلێك یان بەرنامەیێك دەکەینەوە دەبینین کە لە بەشی خوارەوە واتا لەسەر شریتی مهام دا ناوێك زیاد دەبێت وە هەرچەند فایل بکەینەوە ناوەکانیان لەسەر ئەم شریتە دا زیاد دەبێت وە دەتوانین بۆ هێنانی یەکێك لەو فایلانە یان ئەو بەرنامانەی کە لەسەر شێوەکەدا هەن بۆ سەر شاشە ئەم شێوەیەی خوارەوە بە کاربێنین .



٢



دوای زیاد بوونی ناوەکان لە سەر شریتەکە دەتوانی بۆ هینانی یەکیك لەو فایلانە یان ئەو بەرنامانەی کە لەسەر ئەم شریتە دا هەیە سهمی ماوسەکە ببە سەر یەکیك لەو شێوانەی کە لە سەر شریتە دا هەن وە یەك جار کلیکی لای چەپی لە سەر بکە بۆ هاتنە سەر روبەری شاشە .

# وانەی سێ یەم

# لیستە و چوار گۆشەی هەڵبژاردە

# ( القوائم ومربعات الحوار )

## ١- شریتی لیستەکان

شریتی لیستەکان چیە ولە کوێیە ؟

## ٢- کلیلی فەرمانەکان

ئەو فەرمانانەی کە بە کیبورد ئەنجام دەدرێت

## ٣- ئەو فەرمانەی کە بەشی لێ دەبێتەوە

ئەو فەرمانانەی کە بەشی تریان لێ دەبێتەوە

## ٤- ئەو فەرمانانەی کە کردار نین

ئەو فەرمانانەی کە کردار نین واتا کاریان پێ ناکرێ

## ٥- چوار گۆشەی هەڵبژاردە

ئەو بەشانەی کە هەڵبژاردەیان لە دواوەیە

# ١- شریتی لیستەکان

کاری ئەم بەشە تایبەتە بەو شریتەی کە لەناو هەموو پەنجەرەییێکدا هەیە کە دەکەوێتە ژێرەوەی شریتی ناونیشان وە لە هەموو پەنجەرییێک دا بەو شێوەیە وە ئەو چوار لیستەی تێدایە .

١



لێرەدا ئێمە وەکوو پێویست باسی هەندێك لەو لیستانە دەکەین کە پەیوەندی راستەو خۆیان هەیە بەو فایلانەی کە کردوتەوە بۆ نمونە لیستی File ئەگەر بتەوێ بیکەیتەوە دەبێ ئاراستەی ماوسەکە بیەیتە سەر File وە لەوێ یەکجار کلیکی لای چەپ دەکەی دەبینی لیستێکت بۆ دەردەکەوێ دەتوانی هەر یەکێك لەو فەرمان یان هەڵبژاردانەی کە لە ناو لیستەکەدا هەن هەڵبژێری کە دەتەوێ ئەنجامی بدەیت وە لە هەر چوار لیستەکەدا دەتوانی بە هەمان شێوە بیان کەیتەوە وە کاریان لەسەر بکەیت .



سەرەتا بۆ ئەوەی بزانین شریتی لیستەکان (شریط القوائم )لە کوێیە وە کاری چیە وە چی لەسەردایە دەبێ فایلێك بکەینەوە جا هەر فایلێك بێت دەبینین لە ناو پەنجەرەی ئەو فایلەدا لە ژێرەوەی شریتی ناونیشان شریتێکی تر هەیە و چوار لیستی لە سەردایە: File Edit View Help کە هەر یەکێك لەو فایلانە کارێکی تایبەتی خۆی هەیە..

٢



# ٢- کلیلی فەرمانەکان

کاری ئەم بەشە تایبەتە بەو لیسانەی کە هەندی نوسین لە بەرامبەر ناوەکانیان دا نوسراون وە ئەو نوسینانە کاری گرنگی پیّ دەکریّت لە ناو بەرنامەکانی ویندۆس یان بەرنامەکانی ئۆفیس .




١

| | |
|---|---|
| تراجع عن إدراج مربع نص | Ctrl+Z |
| تكرار إدراج مربع نص | Ctrl+Y |
| قص | Ctrl+X |
| نسخ | Ctrl+C |
| لصق | Ctrl+V |
| لصق خاص... | |
| مسح | Delete |
| تحديد الكل | Ctrl+A |
| بحث... | Ctrl+F |
| استبدال... | Ctrl+H |
| الانتقال إلى... | Ctrl+G |

سەرەتا بۆ ئەوەی بزانین گرنگی ئەم کلیلانە بۆ چی بە کاردیّ کلیلی فەرمانەکان ( مفاتيح الاختزال ) واتا ئەو کلیلانەی کە لە جیاتی ئەوەی کە فەرمانێك بە ماوس ئەنجام بدەیت دەتوانی بە هۆی ئەم کلیلانەوە زۆربەی ئەو فەرمانانە لە ڕێگای کیبورد ( لوحە المفاتیح ) وە ئەنجام بدەیت کە دەبیّ گرنگێکی زۆری پی بدرێت وە بەم شێوەیە دەتوانین بزانین کام فەرمان بە کیبورد ئەنجام دەدرێت .

٢




بۆ ئەوەی بزانین کە ئەو کلیلانە لە کوێن دەبی فایلێك بکەینەوە دەبینین کە لە ناو پەنجەرکەدا ئەو لیستانەی تێدایە کە لە بەشەکانی پێشوو باسمان کرد ئێمە لە ناو ئەو لیستانەدا لیستی Edit هەڵدەبژێرین وە وە یەك جار کلیکی لای راست لە سەر شێوەکەی دەکەین دەبینین کە لیستەکەمان بۆ دەردەکەویّ لە ناو لیستە کەدا لە بەرامبەر هەندی لەو فەرمانانە دەبینین کە ئەم شێوە نوسینە هەیە Ctrl + S یان هەر حەرفێکی تر ئەوە مانای وایە کە ئەو فەرمانە بە کیبۆردیش ئەنجام دەدرێت

# ٢- ئەو فەرمانەی کە بەشی لێ دەبێتەوە

کاری ئەم بەشە تایبەتە بەو فەرمانانەی کە کە بەشیان لێ دەبێتەوە واتا هەندی فەرمان هەیە لە ناو شریتی فایلەکان بەشیان لێ دەبێتەوە .



١



سەرەتا بۆ ناسینی ئەم فەرمانانە دەبێ یەکێك لە پەنجەرەکانی ویندۆس بکەینەوە وە ئاراستەی ماوسەکە ببەینە سەر یەکێك لە فایلەکان وەکوو File یان View وە کلیکی لای چەپی لە سەر بکەین بۆ کردنەوەی دەبینین کۆمەڵێ فەرمانی تێدایە ئەوەی لای ئێمە مەبست بێت ئەو فایلانەیە کە بەشی تریان لێ دەبێتەوە .

٢



دوای کردنەوەی لیستی File دێینە سەر ئەو فەرمانەی کە لەتەنیشتەوە ئەم شێوەیەی هەیە ( > ) کە ئەم شێوەیە لە تەنیشت هەر فەرمانێك ببینین ئەوواتا بەشێکی تری لێ دەبێتەوە کە بەم شێوەیە ئاراستەی ماوسەکە لەسەر فەرمانەکە رابگرین دەبینین لیستێکی ترمان بۆ دەرئەکەوێ کە هەندی فەرمانی تری تێدایە بەو شێوەیە دەتوانین ئەو فەرمانە بناسین کە بەشی لێ دەبێتەوە .

# ٤- ئەو فەرمانانەی کە کردار نین

کاری ئەم بەشە تایبەتە بەو فەرمانانەی کە کردار نین وە لە زۆربەی لیستەکاندا توشی ئەم جۆرە فەرمانانە دەبین لەم بەشەدا باس لەو جۆرە فەرمانانە دەکەین .



سەرەتا بۆ ئەوەی کە ئەو فەرمانانە بە شێوەیێکی یەکجاری بناسین وە لە زۆر کاتدا ئەم جورە کردارەمان توش دەبێت بۆ ئەوەی ئێمە ئەم جۆرە فەرمانانە بناسین وە مامەڵەی لە گەڵدا بکەین دەبێ فایلێك بکەینەوە دەبینین کە پەنجەرەی فایلەکەمان بۆ دەردەکەوێ ئێمە لە ناو ئەو پەنجەرەیەدا دەتوانین هەر یەکێك لەو لیستانەی کە لە ناو هەموو فایلێك دا هەیە بچینە سەری وە یەکجار کلیکی لای چەپی لەسەر دەکەین .

١



دوای کلیك کردن لە سەر شێوەکە دەبینین کە لیستەکەمان بۆ دەردەکەوێ کە چەند فەرمانێکی تێدایە لە ناو ئەو فەرمانانە دا دەبینین کە هەندێك لەو فەرمانانە بە شێوەیێکە کە لەوانی تر کاڵترە واتا نوسینەکەی بە شێوەیێکی جوان دیار نیە ئەم فەرمانە بە واتای ئەوە دێت کە هیچ کارێکی پێ ناکرێ بەڵام ئێمە دەتوانین ئەو فەرمانانە کردار بکەین بەوەی کە یەکێك لەو فایلانەی کە لە ناو پەنجەرەکەدا هەن دیاری ( تأشیر ) بکەین ئنجا بچینە سەر لیستەکان دەبینین زۆربەی ئەو فەرمانانەی کە پیشتر کردار نەبوون ئیستا کردارن

٢



# ٥- چوار گۆشەی هەڵبژاردە

کاری ئەم بەشە تایبەتە بەو فەرمانانەی کە لە ناو لیستەکاندا هەیە وە شێوەییەکی تایبەتی هەیە کە بە چوار گوشەی هەڵبژاردە ناسراوە ( مربع الحوار ) ئێمە لەم بەشە دا بە ووردی باسی دەکەین .



سەرەتا بۆ ئەوی بتوانین بە شێوەیێکی یەکجاری ئەم بەشە بناسین وە لەهەموو کاتدا بزانین چۆن مامەڵە لە گەڵ ئەم بەشەدا بکەین دەبی بزانین کە هەندێ هەڵبژاردە هەیە لە گەڵ فەرمانەکان جیاوازە بۆ نمونە لە فەرمانەکانی تردا کاتی کە دەتویست کارێك ئەنجام بدەیت راستەو خۆ دەچویتە ناو لیستەکە وە کلیکت دەکرد لە سەر فەرمانەکە بۆ ئەنجام دانی کارەکە.

١



لەم بەشەدا بە هەمان شێوە دەچیتە سەر فەرمانەکە وە کلیك دەکەیت بەڵام راستەو خۆ کارەکەت بۆ ئەنجام نادات بەڵکو شێوەییێکی ترت بۆ دەر ئەکەوێ کە لە ناو ئەو شێوەیەدا هەندێ هەڵبژاردەی تێدایە بە ئاراستی ماوسەکە دەستکاری فەرمانەکان دەکەیت ئنجا کلیك دەکەیت لەسەر OK یان موافق دەبینی کە بەو شێوەیە کارەکەت بۆ ئەنجام دەدات واتا هەر کاتێك وە لەبەرامبەر هەر فەرمانێك ئەم شێوەیەت بینی ئەوە واتا چوار گۆشەی هەڵبژاردەیە وەکوو چۆن لە شێوەکەدا دیارە .

٢



# وانەی چوارەم

# شریتی مهام و تاییەتمەندیەکانی

## ١- نیشان دانی پەنجەرەکان

نیشان دانی فایلەکان لە سەر شریتی مهام

## ٢- ریکخستنی فایلەکان یەك لە دوای یەك

ریکخستنی هەموو ئەو فایلانەی لە سەر روبەری شاشە دان

## ٣- ریکخستنی فایلەکان ئاسویی وستونی

ریکخستنی فایلەکان لە سەر روبەری شاشە بە شێوەی ئاسویی یان ستونی

## ٤- بزر کردنی هەموو فایلەکان

بزر کردنی فایلەکان بە شێوەیکی کاتی لە سەر روبەری شاشە

## ٥- تاییەتمەندێەکانی شریتەکە

تاییەتمەندی شریتی مهام چیە و لە کوێوە بۆی دەچیت ؟

# ١- نیشان دانی پەنجەرەکان



کاری ئەم بەشە تایبەتە بە نیشان دانی ئەو فایلانەی کە لە کاتی کردنەوە لە سەر روبەری شاشەدا بۆمان دەردەکەوی وە لە هەمان کاتدا لە سەر شریتی مهام دا زیاد دەبێت .

سەرەتا لەم بەشە دا باسی ئەو فایلانە دەکەین کە لە کاتی کرنەوەیان فایلێك ئەوی تر بزر دەکات وە بۆ ئەوەی بتوانین بە شێوەیێکی ئاسایی لە ناو فایلە کاندا کار بکەین دەتوانین هەموو ئەو فایلانەی کە کراونەتەوە بە شێوەییێکی ئاشکرا لێ دیار نیە دەتوانین هەندێ فایل بکەینەوە بۆ ئەوەی بتوانین هەر بەشێك کە بمانەوێ لەو فایلانە بێنینە سەر روبەرەکە وە کاری لە سەر بکەین .

١



دوای کردنەوەی فایلەکان دەبینین ئێمە هەرچەند فایل دەکەینەوە ناونیشانی فایلەکە لە سەر شریتی مهام دا زیاد دەبێت وە دەتوانین ئەو فایلەی کە دەمانەوی بێتە سەر روبەری شاشە بۆ ئەوەی کاری لە سەر بکەین ئاراستەی ماوسەکە ببەینە سەر شریتی مهام وە لەوێ لە سەر شێوەی فایلەکە یەکجار کلیکی لای چەپ لەسەر شێوەکە بکەین تا بۆمان بێتە سەر روبەری شاشە وە دەتوانی ئەو شێوەیە لە گەڵ هەموو ئەو فایلانە بە کاربێنی کە لەسەر شریتی مهام دا هەیە وەکوو لە شێوەکەدا دیارە .

٢



# ٢- ریکخستنی فایلەکان یەك لە دوای یەك

کاری ئەم بەشە تایبەتە بەریکخستنی ئەو فایلانەی کە کراونەتەوە وە لەسەر روبەری شاشە دان بە شێوەی یەک لە دوای یەک ریکیان دەخات ( ترصیف ) لەم بەشە باسی دەکەین .



١



لە سەرەتا دا باس لەم بەشە دەکەین کە ئەگەر کۆمەڵێ فایل بکەینەوە لەسەر یەك چۆن دەتوانین بە شێوەیێك ریکیان بخەین کە هەموو ناونیشانەکانمان لیٚ دیار بێت سەرەتا هەندێك فایل دەکەینەوە تا دینە سەر روبەری شاشە وە دەبینین فایلەکان شێوەییکی ناریکیان هەیە لە سەر روبەری شاشە وەکوو لە وێنەکە دا دیارە .

بۆ ریکخستنەوەی ئەو فایلانەی کە لە سەر روبەری شاشە دا هەن پێویستە دوای کرنەوەی فایلاتێکیٚ زۆر بچینە سەر شریتی مهام وە لەسەر بۆشاییکی ئەو شریتە کلیکی لای راست بکەین تا لیستێکمان بۆ دەردەکەویٚ لەو لیستەدا ئیمە هەلبژاردەی Cascade هەڵدەبژێرین وە کلیکی لای چەپی لە سەر دەکەین بەو شێوەیە هەموو فایلاتەکانمان بۆ ریك دەخات یەك لە دوای یەك وە ناونیشانەکانیانمان لیٚ دیار دەبیٚ بۆ گەرانەوەی بۆ شێوەی پێشوو Undo Cascade هەلبژیرە وە کلیکی لای چەپی لەسەر بکە .

٢



# ٢- ریکخستنی فایلەکان ئاسۆیی وستونی

کاری ئەم بەشە بە هەمان شێوەی کار پێشوە بەڵام لەم بەشەدا شێوەی ریکخستنەکە جیاوازە کە بە شێوەییکی ئاسۆی یان ستونی ( افقی او عمودی ) بۆمان ریک دەخات .



١



لە سەرەتا دا باس لەم بەشە دەکەین کە ئەگەر کۆمەڵێ فایل بکەینەوە لەسەر یەك چۆن دەتوانین بە شێوەییك رێكیان بخەین کە هەموو پەنجەرەکان بە شێوەییکی ئاسۆیی یان ستونی لێ دیار بێت سەرەتا هەندێك فایل دەکەینەوە تا دینە سەر روبەری شاشە وە دەبینین فایلەکان شێوەییکی نارێکیان هەیە لە سەر روبەری شاشە وەکوو لە وێنەکە دا دیارە

٢



١- ئاسۆیی



٢- ستوونی

بۆ ریکخستنەوەی ئەو فایلانەی کە لە سەر روبەری شاشە دا هەن بە شێوەییکی ئاسویی یان ستونی دەتوانین بە هەمان شێوەی جاری پێشوو بچینە سەر شریتی مهام وە لەسەر بۆشاییك کلیك لای راست بکەین تا لیستەکەمان بۆ دەردەکەوێ ئێمە لەو لیستە دا Tile Horizontally یان Tile Verticallyهەڵدەبژێرین وە کلیکی لای چەپ لەسەر یەکێك لەم دوو فەرمانە دەکەین دەبینین کە شێوەی فایلاتەکانمان بۆ رێك دەخات بە شێوەییکی ئاسویی یان ستونی وەك لە شێوەکەدا دیارە

# ٤- بزر كردنی هەموو فایلەكان

كاری ئەم بەشە تایبەتە بە بزر كردنی كاتی هەموو ئەو فایلانەی كە لە كاتی كردنەوەدا دێنە سەر ڕووبەری شاشە ئێمە لەم بەشەدا بە ووردی باسی دەكەین .



سەرەتا لە كاتی كردنەوەی فایلێكی زۆر لەسەر ڕوبەری شاشە دەبینین فایلانەكان ئەو بەشانەی كە لە سەر ڕوبەری شاشە دا هەن بزریان دەكات وە ئەگەر كاتێك ئێمە ئیشمان بە ڕوبەری شاشە بوو ئەو دەتوانین بە شێوەیێكی گشتی هەموو ئەو فایلانە بزر بكەین وە بیانبەینە سەر شریتی مهام وە دوای ئەوە دەتوانین هەموو فایلەكان بگەڕێنینەوە بۆ شوێنی خۆیان لە سەر ڕوبەری شاشە .

١



دوای كردنەوەی فایلەكان ئێمە پێویستمان بە ڕوبەری شاشە دەبێت بۆ ئەوەی كار لە سەر بشێكی بكەین بۆ ئەنجامدانی ئەو كارە دەتوانین بچینە سەر شریتی مهام وە لەوێ لەسەر بۆشاییێكی شریتەكە كلیكی لای ڕاست دەكەین لیستێكمان بۆ دەردەكەوێ لەو لیستە دا فەرمانی Minimize All Windows هەڵدەبژێرین وە كلیكی لای چەپی لە سەر دەكەین دەبینین فایلەكان بزر دەكەن لە سەر ڕوبەرەكە وە دەچنە سەر شریتی مهام بۆ گەڕانەوە دەتوانین لە هەمان لیست دا فەرمانی Undo Minimiz هەڵبژێرین بۆ گەڕانەوە .

٢



# ٥- تایبەتمەندیەکانی شریتەکە



کاری ئەم بەشە تایبەتە بەو شریتەی کە دەکەوێتە بەشی خوارەوەی ڕووبەری شاشەکە لە ڕێگای ئەم بەشەوە دەتوانین بچینە سەر تایبەتمەندیەکانی و کاری لە سەر بکەین.

١



سەرەتا بۆ ئەوەی بزانین کە تایبەتمەندیەکانی ئەم شریتە چین وە کارەکانی چۆن پێ ئەنجام دەدرێ دەبێت ئاراستەی ماوسەکە ببەینە سەر بەشی خوارەوەی ڕووبەری شاشە و لەوێ لەسەر بۆشاییێك کلیکی لای ڕاستی لەسەر بکەین لیستێکمان بۆ دەردەکەوێ لەو لیستەدا Properties هەڵدەبژێرین وە کلیکی لای چەپی لەسەر دەکەین.

٢



دوای کلیك کردن لە سەر Properties شێوەیەکمان بۆ دەردەکەوێ لەو شێوەیەدا چوار چوارگۆشەی بچوکی تێدایە کە دەتوانین بەهۆی ئاراستەی ماوسەکە ئەو چوارگۆشانە دیاری بکەن کە هەر یەك لەو چوارگۆشانە تایبەتە بە شتێك چوارگۆشەی یەکەم ئەگەر دیاری بکەین ئەوە هەر فایلێك بکەینەوە ئەوە شریتەکە لە شوێنی خۆیدا دیار دەبێ وە ئەگەر دیاری کردنەکە لابەین ئەوە بەو شێوەیەی جاران کاتێك فایل بکەینەوە دەبینین فایلەکە شریتەکە بزر ئەکات .

چوارگۆشەی دووەم ئەگەر دیاری بکرێ ئەوە شریتەکە بە شێوەیێکی کاتی بزر دەبێ وە بە هێنانی ئاراستەی ماوسەکە بۆ سەر بەشی خوارەوە شریتەکە دێتەوە، وە بەو شێوەیە دەتوانین دیاری کردنەکە لابەین تا بەو شێوەیەی جارانی لێ بێتەوە.

٣




٤




چوارگۆشەی سێیەم ئەگەر دیاری بکرێ ئەوە لیستی Start لەتەنیشتەوە بە گەورەیی نوسراوە Windows 98 ئەگەر چوارگۆشەکە دیاری بکەین ئەوە ئەو نوسینە دیار نامێنێ وە بۆ هێنانەوەی نوسینەکە دەتوانی هەمان کار ئەنجام بدەی وە دیاری کردنەکە لابەیت .

چوارگۆشەی چوارەم کە دوا چوارگۆشەیە لە ناو شێوەکەدا ئەگەر دیاری بکرێ ئەوە کاتژمێرەکەی سەر شریتەکەمان بۆ دەردەکەوێ بە بەردەوامی لە سەر ئەو شریتە، بەڵام ئەگەر دیاری کردنەکە لابەین ئەوە دەبینین کاتژمێرەکە بزر دەبێ .

٥




**تێبینی: ئەم چوار چوارگۆشەیە لە ناو هەمان شێوەدا هەیە کە لە سەر شریتی مهام دا هەیە وە بەهەمان شێوە دەیانکەینەوە کە دەبێ بچینە سەر شریتەکە وە بە کلیکی لای راستی لە سەر بکەین تا لیستەکەمان بۆ دەرکەوێ ئنجا لە لیستە لیستەکەدا Properties هەڵبژێرین.**

# وانەی پێنجەم

# لیستی ستارت Start

## ١- هەڵبژاردەی Program

ئەو بەشەی کە هەموو بەرنامەکانی تێدایە .

## ٢- هەڵبژاردەی DocumentS

ئەو بەشەی کە بەرنامەکان لە دوای کردنەوە نیشان دەدات .

## ٣- هەڵبژاردەی Settings

ئەو بەشەی کە پارچەکان و سیستەمەکانی ویندوسی تێدایە .

## ٤- هەڵبژاردەی Find

ئەو بەشەی کە بەدوای فایلات دا دەگەڕێ .

## ٥- هەڵبژاردەی Hilp

ئەو بەشەی کە لە کاتی پێویست یارمەتیت دەدات .

## ٦- هەڵبژاردەی Run

ئەو بەشەی کە دەتوانێ بەرنامەیێکی لە ناو دا بهێلیەوە .

## ٧- هەڵبژاردەی Shutdown

ئەو بەشەی کە لە کۆتایی دا نامێرەکە دەکوژێنێتەوە .

## ١- هەڵبژاردەی Program

کاری ئەم بەشە تایبەتە بە لیستی Start وە بە تایبەتی هەڵبژاردەی Program لەم بەشەدا باسی ئەو هەڵبژاردەیە دەکەین وە تیشک دەخەینە سەر ئەو هەنگاوانەی کە بۆ ئەم کارە بە کاری دێنین .



١



بۆ ئەوەی بچینە سەر بەرنامەکان لە ڕێگای لیستی Start دەتوانین ئاراستەی ماوسەکە ببەینە سەر بەشی خوارەوەی ڕووبەری شاشە وە لەوێ لەسەر لیستی Start کلیکی لای چەپ دەکەین دەبینین لیستەکەمان بۆ دەبێتەوە ئنجا لە ناو لیستەکەدا دەچینە سەر Program وە لەوێ ئاراستەی ماوسەکە رادەگرین تا لیستێکی ترمان بۆ دەردەکەوێ لەو لیستەدا هەموو ئەو بەرنامانە دەبینی کە خەزن کراون لە ناو هاردەکە وە دەتوانی لێرەوە کاریان لە سەر بکەیت

سەرەتا بۆ ئەوەی بزانین کە ئەم هەڵبژاردەیە کورتکراوی هەموو ئەو بەرنامانەیە کە لەناو هاردەی ئامێرەکەدا هەیە کە بەم شێوەیە کاتێك هەر بەرنامەیێك لە ناو ئامێرەکەدا خەزن دەکەی دەبینی کە بەرنامەکە لە ناو قرصەکانی My Computer دا دەنیشێ بەڵام لە هەمان کاتدا دەتوانین بچینە سەر ئەو بەرنامانەی کە خەزن کراون بە شێوەیێکی ئاسانتر لەوەی کە لە پێشدا باسمان کرد بەم شێوەیە .

٢



## ٢- هەڵبژاردەی Documents



کاری ئەم بەشە تایبەتە بەو فایلانەی کە پارێزراون واتا ئەم بەشە هەمان کاری My Document ئەبینێ بەڵام لێرەدا دەتوانین بڵێین کە ئەم بەشانەی ناو لیستی Start بە شێوەیێکی گشتی کورتکراوی بەشەکانی ویندۆسن .

١



سەرەتا بۆ ئەوەی بزانین ئەم بەشە کاری چیە یەکێك لە بەرنامەکانی ئۆفیس یان ویندۆس دەکەینەوە، بۆ نمونە بەرنامەی وێنە کێشان Paint دەکەینەوە وە هەندێ کاری لەسەر دەکەین ئنجا ئەو بەشەی کارمان لەسەر کردوە خەزنی دەکەین وە ناوێکی لێ دەنین ئنجا بەرنامەکە دادەخەین .

٢



دوای ناو لێنانی فایلەکە وە دوای داخستنی ئەگەر بمانەوێ جارێکی تر بیکەینەوە وە کاری لە سەر بکەین ئەوە دەتوانین لە جیاتی ئەوەی کە بچینە سەر My Doumentدەچینە سەر لیستی ستارت وە لەوێ کلیك لەسەر لیستە دەکەین ئنجا دەچینە سەر Documents وە لەوێ ئاراستەی ماوسەکە رادەگرین دەبینین بەشێکی ترمان بۆ دەردەکەوێ لەو بەشەدا دەبینین ئەو فایلەی کە بە ناوێکەوە خەزنمان کردبوو لێرەدا بەر چاومان دەکەوێ دەتوانین بۆ کردنەوەی کلیکی لای چەپی لەسەر بکەین.

# ٣- هەڵبژاردەی Settings



کاری ئەم بەشە لە هەندێ فەرمانی لەیەک جیاواز پێک هاتووە کە هەر یەکێک لەو فەرمانانە تایبەتە بە شتێک وە ئەم بەشە زیاتر تایبەتمەندی ئەوەی هەیە کە بەشێک زیاد بکەی یان بەشێک لابەی .

سەرەتا بۆ ئەوەی کاری ئەم بەشەمان لا رون بێتەوە دەتوانین بەشەکانی پێناسە بکەین

١- Control Panel     ٢- Printers

٣- Taskbar     ٤ - Folders Option

٥- Active Disktop

بەشی یەکەم و بەشی دووەم وانەی تایبەتی لە سەر دامەیە بەشی سێیەم تایبەتەبە لابردن و دانانی بەشێك لە ناو لیستی Startبەشی چوارەم تایبەتە بە تایبەتمەندیەکانی شێوەی فایلەکانی ویندۆس بەشی پێنجەم تایبەتە بە شێوازەکانی سەر روبەری شاشە .

١/



٢



بۆ چونە سەر ئەم بەشە دەبێ ئەم هەنگاوانە بەکاربێنین سەرەتا دەچینە سەر لیستی Start وە لەوێ کلیکی لای چەپ دەکەین لەسەر لیستەکە ئنجا دەچینە سەر Settings وە لەوێ ئاراستەی ماوسەکە رادەگرین لەسەر Settings دەبینین بەشێکی تری لێ دەبێتەوە لەو بەشەدا ئەو پێنج هەڵبژاردەیەی تێدایە کە لەسەرەوە باسمان کرد .

# ٤- هەڵبژاردەی Find

کاری ئەم بەشە تایبەتە بە گەڕان بە دوای فایل یان فۆڵدەر کە لەم بەشەدا دەتوانی ئەگەر فایلێکت لێ بزر بوو ئەو بە هۆی ئەم بەشەوە دەتوانی بیدۆزیتەوە بەم شێوەیەی لای خوارەوە .



سەرەتا بۆ ئەوەی بزانین کاری گەڕان لەم بەشەدا بە مەبەستی چی دێت ئەوە ئێمە بە ووردی باسی دەکەین تا بتوانین ئەگەر فایلێك یان ئایکونەیێك لە ناو بەشەکانی ویندۆس دا بزر بوون ئێمە چۆن بتوانین بەدوای ئەو فایلەدا بگەڕێین وە بیدۆزینەوە بۆ ئەنجام دانی ئەم کارەش ئەم هەنگاوەی خوارەوە پەیرەو بکە :

١



سەرەتا دەچینە سەر لیستی Start وە لەوێ کلیکی لای چەپ دەکەین لە سەر لیستەکە دەبینین لیستەکەمان بۆ دەبێتەوە ئنجا دەچینە سەر Find وە لەوێ ئاراستەی ماوسەکە رادەگرین تا بەشەکانی ترمان بۆ دەرکەوێ، ئێمە Files Or Folders هەڵدەبژێرین وە کلیکی لای چەپی لەسەر دەکەین شێوەیکمان بۆ دەردەکەوێ لەو شێوەیەدا سێ بۆشاییمان هەیە لە بۆشای یەکەمدا ناوی فایلەکە دەنوسین وە کلیك دەکەین لەسەر Find Now دەبینین بەدوای ناوەکەدا دەگەڕێ تا دەیبینێتەوە .

٢



## ٥- هەڵبژاردەی Hilp

کاری ئەم بەشە تایبەتە بە یارمەتدانت لە کاتی ئیش کردندا لە ناو سیستەمی ویندۆس کە دەتوانی بە هۆی ئەم بەشەوە یارمەتی داوا بکەیت بەم شێوەیەی لای خوارەوە :



١



سەرەتا بۆ ئەوەی بتوانین بە شێوەیێکی راست ئەم بەشە بەکاربینین دەتوانین هەر لە سەرەتاوە داوای یارمەتی لەم بەشە بکەین بەم شێوەیە سەرەتا دەچینە سەر لیستی Start وە لەوێ کلیکی لای چەپ لەسەر لیستە دەکەین تا لیستەکەمان بۆ دەر دەکەوێ .

دوای دەرکەوتنی لیستی Start دەچینە سەر هەڵبژاردەی Help وە لەوێ کلیکی لای چەپ دەکەین لەسەر Help دەبینین شێوەیێکمان بۆ دەردەکەوێ کە لەو شێوەیەدا هەنگاوەکانی ویندۆسی تیدا باس کراوە ئێمە دەتوانین هەر یەك لەو کتیبانەی کە لەناو شێوەکەدا هەن هەڵیان بژێرین وە کلیکیان لەسەر بکەین تا بە نووسین بۆمان دەر بخات، دەتوانین سود لەم هەنگاوانە وەربگرین وە هەروەها زۆر ووردەکاری تێدایە لە بارەی سیستەمی ویندوس .

٢



## ٦- هەڵبژاردەی Run

کاری ئەم بەشە تایبەتە بە بەشێک یان بەرنامەیێک کە بتەوێ لە شوێنێکدا بە بەردەوامی بیهێڵیەوە وە هەموو کات بۆ کردنەوەی لە رێگای ئەم بەشەوە بیکەیتەوە



١



سەرەتا بۆ ئەنجام دانی ئەم کارە دەتوانین بچینە سەر لیستی Start وە لەوێ کلیکی لای چەپ بکەین لەسەر لیستەکە تا لیستەکەمان بۆ دەربکەوێ ئنجا دەچینە سەر هەڵبژاردەی Run وە لەوێ کلیی لای چەپی لەسەر دەکەین تا شێوەیێکمان بۆ دەردەکەوێ .

٢



دوای دەرکەوتنی شێوەکە دەبینین کە بۆشاییێکی تێدایە وە لەبەشی خوارەوەی بۆشاییەکە سێ فەرمانی تێدایە ئێمە لەناو ئەو فەرمانانەدا Browse هەڵدەبژێرین وە کلیکی لە سەر دەکەین تا شێوەیێکی ترمان بۆ دەردەکەوێ، ئێمە دەتوانین لە ناو شێوەی دووەمدا یەکێك لە بەرنامەکان هەڵبژێرین وە کلیکی لە سەر دەکەین تا بێتە ناو بۆ بۆشاییەکەوە ئنجا کلیك دەکەین لەسەر OK بۆ ئەنجامدانی کارەکە دەتوانین هەموو ئەو بەرنامەیەی کە هێنامانە ناو بەشەوە لێرەوە بیکەینەوە .

## ٧ - هەڵبژاردەی Shutdown

کاری ئەم بەشە تایبەتە بە چۆنیتی کوژانەوەی ئامێرەکە بە شێوەیێک کە زیان بە سیستەم و بەرنامەکانی ویندۆس نەکات



سەرەتا دەبێ هەموو ئەو بەرنامانەی کە لەبەر دەستت دایە یان لەسەر روبەری شاشە دان دایان بخەیت، ئنجا دەچیتە سەر قائمەی **Start** وە لەوێ یەکجار کلیکی لای چەپ دەکەیت لیستێکت بۆ دەر ئەکەوێت لەو لیستەدا هەڵبژاردەی **Shut Down** هەڵدەبژێری و یەکجار کلیکی لای چەپ دەکەیت بۆ کردنەوەی .

١



دوای کلیک کردن لەسەر **Shut Down** دەبینێ شێوەیێکی ترمان بۆ دەردەکەوێت لەو شێوەیەدا سێ هەڵبژاردەی تێدایە بۆ کوژانەوە **Shut Down** هەڵبژێرە وە بۆ سەر لە نوێ ئیش پێ کردنەوە **Restart** هەڵبژێرە وە بۆچونە ناو **MS.DOS** لە دوای **Restart** کردنەوە **Restart In Ms.Dos** هەڵبژێرە وە یەکجار کلیکی لای چەپ بکە لە سەر **ShutDown** وە چاوەرێ بکە تا ئەم شێوەیەی وێنەکەت بۆ دەردەکەوێ، ئنجا ئامێرەکە بکوژێنەوە .

٢

it is now safe to turm off your computer

# وانەی شەشەم

# بەڕێوەبردنی فایلەکان

## ١-ڕێکخستنی ئایکونەکان و زانینی زانیاریەکان

چونێتی ڕێکخستن یان زانینی زانیاریەکانی فایلەکانی ویندۆس

## ٢- گواستنەوە و لەبەرگرتنەوە بە هۆی ماوس یان شریتی تحرير

چونێتی گواستنەوە یان لەبەرگرتنەوەی فایلێک بە ماوس یان بە شریتی تحرير

## ٣- راکێشانی فایلێك بە کلیکی لای راست یان چەپ

چونێتی راکێشان بە کلیکی راست یان چەپ

## ٤- راکێشانی فایلێك بۆ سەر ڕووبەری شاشە

چونێتی راکێشان بۆ سەر ڕووبەری شاشە

## ٥- گواستنەوەی فایلێك بۆ سەر دێسك

چونێتی گواستنەوەی فایلێک لە شوێنێکەوە بۆ سەر دێسک

## ٦- سڕینەوەی فایلێك

چۆنێتی سڕینەوەی فایلێک

# ١- ڕێکخستنی ئایکۆنەکان وزانینی زانیاریەکان



کاری ئەم بەشە تایبەتە بە ڕێکخستن و زانینی زانیاری دەربارەی ئەو فایلانەی کە لەبەر دەستتدان، دەتوانین بۆ ئەنجام دانی ئەم کارە ئەم هەنگاوانە بەکاربێنین .

سەرەتا بۆ ئەوەی بتوانین بە شێوەیێکی ڕاست فایلەکانمان ڕێك بخەین بە شێوەیکی گەورە یان بچوك یان بە شێوەی لیست یان بە شێوەیێك کە زانیاریەکانمان لە بەرامبەر نیشان بدات دەتوانین سەرەتا یەکێك لە فایلەکان بکەینەوە دەبینین کە هەندێ ئایکونەی تێدایە ئێمە دەتوانین شێوەی ئایکونەکان بگۆڕین، بەم شێوەیە دەچینە سەر لیستی View لەوێ کلیك دەکەین لەسەر لیستەکە تا فەرمانەکانی ناو لیستەکەمان بۆ دەرکەوێ .

١



دوای دەرکەوتنی فەرمانەکان دەچینە سەر ئەم چوار فەرمانە کە فەرمانی Large Icons بۆ گەورەکردنی ئایکونەکان بەکاردێ وە Small Icons بۆ بچوك کردنی ئایکونەکان بەکاردێ وەList بۆ شێوەی لیست بە کاردێ وە Details بۆ زانینی زانیاری دەربارەی ئایکونەکان بە کار دێت بەم شێوەیە ئێمە دەتوانین کلیك لە سەر هەر بەشێك لەم بەشانە بکەین تا بەو شێوەیەی لێ بێت کە خۆمان مەبەستمانە .

٢



# ٢- گواستنەوە و لەبەرگرتنەوە بە هۆی ماوس یان شریتی تحریر



کاری ئەم بەشە تایبەتە بە گواستنەوە و لەبەر گرتنەوەی فایلێک لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر کە دەتوانین بەم شێوەیەی لای خوارەوە ئەم کارانە ئەنجام بدەین :

سەرەتا بۆ ئەوەی بتوانین فایلێک لە شوێنێکەوە بگوازینەوە شوێنێکی تر دەبێت یەکێک لە بەشەکانی ویندۆس بکەینەوە بۆ نمونە **My Document** دەکەینەوە دەتوانین یەکێک لە فایلەکانی ناو ئەم بەشە بە ئاراستەی ماوسەکە دیاری بکەین وە بچینە سەر شریتی تحریر، لەوێ کلیک لەسەر شێوەی **Cut** یان **Copy** بکەین، ئنجا دەچینە سەر ئەو شوینەی کە دەمانەوێ لیێ دابنێین، ئەو دوو شێوەیەی کە ئامارەم بۆی کردبوو لە وێنەکەدا دیارە ئەم کارە بە شریتی تحریر دەکرێ.

١




٢




بۆ ئەوەی بتوانین هەمان کار بە ماوسەکە ئەنجام بدەین دەبێ بچینە سەر **My Document** وە دەیکەینەوە، ئنجا دەچینە سەر یەکێك لە ئایکونەکانی ناو ئەو بەشە وە بە کلیکی لای راستی ماوسەکە کلیك دەکەین لەسەر ئەو ئایکونەیەی کە دەمانەوێ کۆپی بکەین تا لیستەکەمان بۆ دەرکەوێ. ئنجا بە هەمان شێوە **Copy** یان **Cut** هەڵدەبژێرین وە کلیکی لای چەپی لەسەر دەکەین بۆ ئەنجامدانی کارەکە.

## ٣- راكێشانی فایلێك بە كلیكی لای راست یان چەپ



كاری ئەم بەشە تایبەتە بە راكێشانی فایلێك لە شوێنێكەوە بۆ شوێنێكی تر كە ئەم كارەش هەمان شێوەیە لەگەڵ كاری پێشوو بەڵام لەم بەشەدا بە هۆی ئاراستەی ماوسەكەوە ئەم كارە ئەنجام دەدرێ .

بۆ ئەنجامدانی ئەم كارە دەتوانین بە هەردوو كلیكی لای راست و كلیكی لای چەپ ئەم كارە ئەنجام بدەین بەم شێوەیە سەرەتا دەچینە سەر My Document وە لەوێ كلیكی لای راست لە سەر ئەو فایلە دەكەین كە دەمانەوێ بیگوازینەوە بۆ شوێنێكی تر بێ ئەوەی كلیكەكە بەر بدەین وە ئاراستەی ماوسەكە رادەكێشینە سەر ئەو شوێنەی كە دەمانەوێ لیێ دابنێین، كە ئاراستەكە گەیشتە سەر ئەو شوێنەی دەمانەوێ لێی دابنێین كلیكەكە بەردەدەین دەبینین لیستێكمان بۆ دەردەكەوێ لەو لیستەدا فەرمانی Cut یان Copy هەڵدەبژێرین وە كلیكی لای چەپی لەسەر دەكەین بۆ ئەنجامدانی كارەكە.

١



بۆ ئەنجام دانی ئەم كارە بە كلیكی لای چەپ دەتوانین هەمان هەنگاو بەكاربێنین بەڵام لەم بەشەدا كاتێ كە فایلەكە رادەكێشین بۆ سەر ئەو شوێنەی كە دەمانەوێ لیێ دابنێین وە كاتێ كە كلیكەكە بەردەدەین دەبینین كاری گواستنەوەكەمان یەكسەر بۆ ئەنجام دەدات بێ ئەوەی هیچ فەرمانێك یان لیستێكمان بۆ دەركەوێ .

٢



# ٤- راكێشانی فایلێك بۆ سەر ڕووبەری شاشە



کاری ئەم بەشە تایبەتە بە فایلێک کە بمانەوێ بیگوازینەوە بۆ سەر ڕووبەری شاشە وە بەبەردەوامی لەوێ کاری لەسەردا بکەین .

بۆ ئەوەی بتوانین بەشێکی گرنگ لە ناو هاردی کۆمپیوتەرەکەدا بێنینە سەر ڕووبەری شاشە وە بە بەردەوامی لەسەر ڕووبەری شاشەدا بێت دەتوانین ئەم هەنگاوانە بەکاربێنین:

سەرەتا دەچینە سەر My Computer وە لەوێ دەیکەینەوە ئنجا دەچینە سەر ئەو بەشە هاردەی کە شتەکانی تیدایە واتا Program File وە ئەویش دەکەینەوە دەبینین کۆمەڵی بەرنامەی تێدایە کە خۆمان پێشتر خەزنمان کردوە .

١



دوای کردنەوەی Program File دەچینە سەر ئەو بەشەی کە دەمانەوێ بیبەینە سەر ڕووبەرەکە وە کلیی لای چەپ لە سەر فایلەکە دەکەین بێ ئەوەی کە کلیکەکە بەربدەین، ئنجا وەکو ئاراستەی ماوسەکە فایلەکە ڕادەگێشین بۆ سەر ڕووبەری شاشە وە لەوێ دا کلیکەکە بەر دەدەین دەبینین کە ئەو فایلەمان بۆ هاتە سەر ڕووبەری شاشە وە دەتوانین هەموو کات لەسەر ڕووبەرەکە بیکەینەوە وە کاری لەسەر بکەین .

٢



## ٥- گواستنەوەی فایلێك بۆ سەر دێسك



کاری ئەم بەشە تایبەتە بە گواستنەوەی فایلێک بۆ سەر دێسک کە بەم شێوەیە دەتوانین ئەم هەنگاوانە بە کاربێنین تا بتوانین فایلێک بگوازینەوە بۆ سەر دێسک .

١



سەرەتا بۆ ئەوەی بتوانی بەشێوەیێکی ئاسان فایلێك بگوازیتەوە بۆ سەر دێسك دەبێ فایلێك بکەینەوە بۆ نمونە My Document دەکەینەوە وە دەچینە سەر یەکێك لە فایلەکانی ناو ئەم بەشە ئنجا بە دوو شێوە دەتوانین ئەو فایلە بگوازینەوە بۆ سەر دێسك: یەکەم شێوە لەسەر شێوەی فایلەکە کلیکی لای راست دەکەین تا لیستەکەمان بۆ دەرکەوێ ئنجا لە ناو لیستەکەدا دەچینە سەر Send To Floppy وە کلیکی لای چەپی لەسەر دەکەین تا کارەکەمان بۆ ئەنجام بدات .

٢



شێوەی دووەم بۆ ئەنجامدانی گواستنەوەی فایلێك بۆ سەر دێسك بەم شێوەیە دەبێت سەرەتا دەچینە سەر شێوەی فایلەکە وە لەسەر فایلەکە کلیکی لای راست دەکەین تا لیستەکەمان بۆ دەرکەوێ ئنجا لەوێ Copy یان Cut هەڵدەبژێرین وەکلیکی لای چەپی لەسەر دەکەین ئنجا دەچینە سەر قرصی دێسکەکە وە لەوێ Paste واتا دایدەنێین دەبینین کاری گواستنەوەکەمان بۆ ئەنجام دەدات .

# ٦- سڕینەوەی فایلێك

کاری ئەم بەشە تایبەتە بە چۆنێتی سڕینەوەی فایلێک دوای ئەوەی کە کارمان بە فایلەکە نەما، دەتوانین ئەم هەنگاوانە بەکاربێنین بۆ سڕینەوەی هەر فایلێک .



١




سەرەتا بۆ ئەنجامدانی ئەم کارە وە بۆ سڕینەوەی فایلێك دوای ئەوەی کە هیچ کارێکمان بەو فایلە نەما دەبێ بچینە سەر شێوەیی فایلەکە وە لەوێ کلیك لای ڕاست لە سەر فایلەکە دەکەین تا لیستەکەمان بۆ دەرئەکەوێ، ئنجا دوای ئەوە لە ناو لیستەکەدا Delete هەڵدەبژێرین وە کلیکی لای چەپی لەسەر دەکەین دەبینین شێوەیێکی ترمان بۆ دەردەکەوێ کە پێمان دەڵی ئایا دەتەوێ ئەم فایلە بسڕیتەوە بۆ سڕینەوەی فایلەکە کلیك بکە لەسەر Yes دەبینین فایلەکە دەچێتە ناو Recycle Bin .

دەتوانین ئەم کارە بەهۆی کیبۆردەکەوە ئەنجام بدەین کە هەمان هەنگاو دەنین وە دەچینە سەر ئەو فایلەی کە دەمانەوێ بیسڕینەوە لەوێ کلیکی لای چەپ دەکەین لەسەر فایلەکە بۆ دیاری کردنی فایلەکە ئنجا دەچینە سەر کلیلی Delete لە سەر کیبوردەکە وە کلیلەکە دادەگرین شێوەیێکی ترمان بۆ دەردەکەوێ پێمان دەڵی ئایا دەتەوێ ئەم فایلە بسڕیتەوە بۆ ئەنجام دانی سڕینەوەکە هەر بە کیبۆردەکە کلیلی Enter لێ بدە .

٢



# وانەی حەوتەم

## پاراستنی ئامێرەکە

### ١- زانینی قەبارەی هاردەکە

چونیتی زانینی قەبارەی هاردەکە

### ٢- کرداری زانینی هەڵە لە ناو هاردەکە

چونێتی زانینی هەلەیەک کە لە رێگای پچرانی تەزوی کارەباوە توشی ئامێرەکە دەبێت

### ٣- وێنەیێکی یەدەکی

چونێتی دانانی وێنەیێکی یەدەکی لە سەر دیسک یان کاسێت

### ٤- کرداری رێکخستنی کشتی

چونیتی ریکخستنی هەموو فایلەکانی ناو ویندوس

### ٥- چۆنێتی زانینی مواصەفاتی ئامێرەکە

چونێتی زانینی مواصەفاتی کۆمپیوتەرەکە

# ١- زانینی قەبارەی هاردەکە

کاری ئەم بەشە تایبەتە بە زانینی قەبارەی هاردی کۆمپیوتەرەکە کە دەتوانین بەم شێوازانەی لای خوارەوە باسی دەکەین .



سەرەتا لەم بەشەدا بۆ ئەوەی بتوانین بەشێوەیێکی راست قەبارەی هاردەکە بزانین دەبێ ئەم هەنگاوانە بە کاربینین.
سەرەتا دەچینەسەر My Computer وە دەیکەینەوە ئنجا دەچینە سەر قرصی هاردەکان کە چەند بەشە هاردێکمان هەیە وە کلیکی لای راست لە سەر یەکێك لە هاردەکان دەکەین تا لیستەکەمان بۆ دەردەکەوێ .

١



دوای ئەوەی کە لیستەکەمان بۆ دەردەکەوێ دەچینە سەر Properties وەکلیکی لای چەپی لە سەر دەکەین شێوەیێکمان بۆ دەردەکەوێ لەو شێوەیەدا بازنەییێك دەبینین کە بەدوو رەنگ خۆی نیشان دەدات رەنگی پەمبە و رەنگی شین رەنگی پەمبە بە مانای بەتاڵ دێت واتا ئەوەندە کە پەمبەیە بەتاڵە، وە رەنگی شین بە مانای پڕ دێت واتا ئەوەندە کە شینە پڕە، وە ژمارەکانی قەبارەکە لە بەرامبەر رەنگەکان نووسراوە وە لە سەرەوەی بازنەکە قەبارەی گشتی هاردەکە نووسراوە .

٢



# ٢- کرداری زانینی هەڵە لە ناو هاردەکە



کاری ئەم بەشە تایبەتە بە زانینی هەڵەیێک کە بە هۆی پچڕانی تەزوی کارەباوە توشی ئامێرەکە دەبێ کە بەم شێوەیە دەتوانین بزانین کە هەڵەمان توش بووە یان نا .

١



سەرەتا بۆ ئەوەی بە شێوەیێکی راست بتوانین ئەم کارە ئەنجام بدەین وە مامەڵە لە گەڵ ئەم جۆرە کردارە بکەین دەتوانین ئەم هەنگاوانە بەکاربێنین:

سەرەتا دەچینە سەر My Computer وە دەیکەینەوە ئنجا دەچینە سەر ئەو بەشە هاردەی کە دەمانەوێ بزانین هەڵەی تێدایە وە کلیکی لای راستی لە سەر دەکەین تا لیستەکەمان بۆ دەرکەوێ ئنجا کلیك دەکەین لە سەر Propertiesدەبینین کە شێوەیێکمان بۆ دەردەکەوێ لەو شێوەیەدا دەچینە سەر tools .

دوای دەرکەوتنی شێوەکە وە دوای ئەوەی کە دەچینە سەر Tools کلیکی لای چەپی لە سەر دەکەین هەر هەمان شێوەمان بۆ دەگۆرێ ئنجا دەچینە سەر Check now وە کلیك دەکەین دەبینین شێوەیێکی ترمان بۆ دەردەکەوێ ئنجا ئەو بەشە هاردەی کە دەمانەوێ کردارەکەی بۆ بکەین دیاری دەکەین وە کلیك دەکەین لەسەر Start تا کردارەکەمان بۆ ئەنجام بدات ئەم کردارە زەروریە ماوە ماوە بکرێ.

٢



# ٣- وێنەیێکی یەدەکی

کاری ئەم بەشە تایبەتە بە دانانی وێنەیێکی یەدەکی بۆ ئەو بەشانەی کە لە ناو هاردەکەدا هەن هەرچەندە ئەم کارە نابێ گرنگی پێ بدری بەڵام ئێمە لە بەشەدا باسی دەکەین



سەرەتا بۆ ئەوەی کە بتوانین وێنەیێکی یەدەکی بۆ بەشە گرنگانە دابنێین کە لە ناو هاردەکە دابنێین لە ناو دێسك یان کاسێت دەتوانین ئەم هەنگاوانە بە کاربێنین، هەرچەندە کارێکی ئاڵۆزە بەڵام لەم بەشەدا دەبێ بچینە سەر MY Computer وە لەوێ دەیکەینەوە ئنجا دەچینە سەر بەشە هاردەکە وە لە سەر شێوەی هاردەکە کلیکی لای راست دەکەین تا لیستەکەمان بۆ دەرکەوێ ئنجا دەچینە سەر Propertiesوە کلیکی لای چەپی لە سەر دەکەین تا هەمان شێوەی پێشوومان بۆ دەرکەوێ .

١



دوای ئەوەی شێوەکەمان بۆ دەردەکەوی دەچینە سەر Tools وە کلیك دەکەین ئنجا دەچینە سەر Backup Now وە کلیکی لای چەپی لە سەر دەکەین دەبینین دیسان شێوەیێکی ترمان بۆ دەردەکەوێ لەو شێوەیەدا بەشە هاردەکە دیاری دەکەین کە دەمانەوێ بەشێکی یەدەکی تێدا دابنێین وە کلیك دەکەین لەسەر Start دوای دیاری کردنی بەشە هاردەکە .

٢



# ٤- کرداری ڕێکخستنی کشتی

کاری ئەم بەشە تایبەتە بە ڕێکخستنی هەموو ئەو فایلانەی کە لە ناو ئامێرکەدا هەن کە دەتوانین بەم شێوازە ئەم کارە ئەنجام بدەین .



ئەنجام دانی ئەم کارە زۆر گرنگە وە زۆر پێویستە مانگی جارێك ئەم کارە ئەنجام بدرێ بەم شێوەیە:
سەرەتا My Computer دەکەیتەوە وە دەچیتە سەر ئەو بەشە هاردەی کە دەتەوێ ئەم کارەی بۆ بکەی وە کلیکی لای ڕاست دەکەی تا لیستەکەت بۆ دەردەکەوێ ئنجا Properties هەڵدەبژێری وە کلیکی لای چەپی لە سەر دەکەی تا شێوەیێکی ترت بۆ دەرئەکەوێ لەو شێوەیەدا دەچیتە سەر Tools وە لەوێوە دەچیتە سەر Defragment now وە کلیکی لای چەپی لە سەر دەکەی .

١



دوای کلیك کردن شێوەیێکی تر دەردەکەوێ لەو شێوەیەدا دیارە دەکەوێ کە ئەم بەشە بە جورێك فایلەکانی ناو کۆمپیوتەرەکە ڕێك دەخات وە هەر هەڵەیێك هەبێت دەتوانی لە ڕێگای ئەم بەشەوە بیزانی وە دەتوانی بۆ زانیاری زیاتر دەربارەی ئەم بەشە بچیتە سەر Show Details وە کلیکی لای چەپ بکە شێوەی ڕێکخستنەکەت بۆ دەردەکەوێ .

٢



# ٥- چۆنێتی زانینی مواصەفاتی ئامێرەکە



کاری ئەم بەشە چۆنێتی زانینی مواصەفاتی کۆمپیوتەرەکەیە کە دەتوانی لە ڕێگای ئەم بەشەوە مواصەفاتی هەموو ئامێرێکی کۆمپیوتەر بزانی .

١



بۆ زانینی مواصەفاتی کۆمپیوتەرەکە ئەم هەنگاوانە بەکاربێنە:

سەرەتا بڕۆ سەر ئایکونی My Computer وە لەسەر شێوەی ئایکونەکە کلیکی لای ڕاست بکە تا لیستەکەت بۆ دەرئەکەوێ لە ناو لیستەکەدا Properties هەڵبژێرە وە کلیکی لای چەپی لەسەر بکە شێوەیێکت بۆ دەرئەکەوێ لەو شێوەیەدا لە General هەڵبژێرە هەرچەندە هەموو کات خۆی لە سەر ئەم بەشە دەبێت

٢



دوای دەرکەوتنی بەشی General لە شێوەکەدا دەبینین کە ئەم شێوەیە هەمووی نووسینی لاتینیە وە ئەو نوسینانە مواصەفاتی ئامێرەکەت نیشان دەدات وەکوو رام و پینتیوم واتا لەم بەشە دەتوانی بزانی کە رامی ئەو ئامێرە یان پینتیوم چەندە وە شێوەیێکی تر هەیە کە لەسەرتای پێ کردنی ئامێرەکە خێرایی ئامێرەکەت نیشان دەدات .

# وانەی هەشتەم

# گۆشەی زانیاریەکانControl Panel

## ١-کات و بەروار Dat / Time

چۆنێتی زانینی کات و بەروار و چاکردنی

## ٢- فۆنتەکان Fonts

چۆنێتی دانانی خەتێکی تازە لە ناو نیزامی ویندوس

## ٣- وێنەی پشتەوەی شاشە Background

چۆنێتی گورینی پشتەوەی روبەری شاشە

## ٤- پاریزەری روبەری شاشە Screen saver

چۆنێتی گۆرینی سکرین سایڤەر

## ٥- گۆرینی رەنگی ئایکونەکان Appearanca

چۆنێتی گۆرینی رەنگی فایلاتەکانی ویندوس

## ٦- گۆرینی قەبارەی ئایکونەکان Settings

چۆنیتی گورینی قەبارە و رەنگەکانی ناو کۆمپیوتەرەکە

## ٧- دوگمەکانی ماوس Mouse

چۆنێتی گورینی کلیکی راست بو چەپ وە بە پێچەوانەوە

## ٨- شێوەی ئاراستەکە Pointers

چۆنێتی گۆرینی شێوەی مونەشەری ماوسەکە

## ٩- جولەی ئاراستەکە Motion

چۆنیتی گورینی خێرایی و جولانەوەی ماوسەکە

# ١- كات و بەروار Dat / Time

کاری ئـەم بەشە تایبەتە بە چۆنیتی زانین و چاکردنـەوەی کـات و بـەروار لـە نـاو کۆمپیوتەرەکەدا کە دەتوانی لە ڕێگـای ئەم بەشەوە کات و بەروار دەستکاری بکەی .



سـەرەتا بـۆ ئـەنجام دانـی ئـەم کـارە پێویستە بچینە سەر قائمـەی Start کلیکی لای چەپی لە سـەر دەکەین ئنجا دەچینە سـەر هـەڵبژاردەی Setting وە لـەوێوە دەچینە سـەر Control Panel وە کلیکی لای چەپی لەسەر دەکەین تـا شێوەیێکمان بـۆ دەردەکـەوێ ئنجـا دەچینـە سـەر Dat/Time و دوو جار کلیکـی لای چـەپی لەسـەر دەکـەین تـا شـێوەکەیمان بـۆ دەردەکەوێ.

١



٢



دوای دەرکـەوتنی شـێوەی Dat/Time دەتوانین لە بەشی ساڵەکان ئـەو ساڵە دیـاری بکـەین کـە تیـایداین، هـەروەها لـە بەشـی مانگەکان ئەو مانگە دیاری بکەین کە تیایداین، وە لە چوار گۆشەکەی ژێرەوەی سـاڵ و مـانگ ژمارەی ئەو ڕۆژە دیاری دەکەین وە لە لاکێشە بچوکەکەی لای راستی شێوەکە کاتەکە دیـاری دەکەین وە کلیك دەکـەین لـە سـەر Ok بـۆ ئەنجام دانی ڕێکخستنی کات و بەروارەکە .

## ٢- فۆنتەکان Fonts

کاری ئەم بەشە تایبەتە بە دانانی فۆنتێکی تازە لە ناو کۆمپیوتەرەکە، لەکاتێکدا کە پێویستیت بە جۆرە خەتێک دەبێت و ئەو خەتە لە ناو ئامێرەکەدا نیە دەتوانی بەم شێوەیە خەتێکی تازە دابنێیت.



سەرەتا بۆ دانانی خەتێکی تازە لە ناو کۆمپیوتەرەکەدا دەبێ هەندێ فۆنت هەبێ جا لە سەر CD یان دێسك ئەو کاتە دەچیتە سەر قائمەی Start وە لەوێوە دەچیتە سەر Control Panel وە کلیکی لای چەپی لە سەر دەکەیت تا شێوەیێکت بۆ دەردەکەوێ ئنجا لە شێوەکەدا دەچیتە سەر Fonts وە دوو جار کلیکی لای چەپی لەسەر دەکەیت تا شێوەیێکی ترت بۆ دەردەکەوێ .

١



دوای دەرکەوتنی شێوەی دووەم دەچیتە سەر شریتی لیستەکان وە لەوێ لە سەر File کلیکی لای چەپ دەکەیت تا لیستەکەت بۆ دەبێتەوە ئنجا Install New Font هەڵدەبژێری وە کلیکی لە سەر دەکەیت تا شێوەیێکی ترت بۆ دەردەکەوێ ئنجا لەو شێوەیەدا لە لاکێشەی بەشی خوارەوەی لای راست CD دیار دەکەیت لە بەرامبەردا ناوەرۆکی CDیەکە نیشان دەدات ئنجا لەسەر Font کلیك دەکەین وە رائەوستین تا ئەبێت بە ١٠٠ ٪ ئنجا لە بۆشایی سەرەوە فۆنتەکانمان بۆ نیشان دەدات ئنجا کلیك دەکەین لە سەر Select All ئنجا OK .

٢



## ٢- وێنەی پشتەوەی شاشە Background



کاری ئەم بەشە تایبەتە بەو وێنەیەی کە دەکەوێتە پشتەوەی روبەری شاشە. لەم بەشەدا باسی ئەوە دەکەین کە چۆن وێنەکە دەگۆڕین .

١



سەرەتا بۆ دانانی وێنەیێکی تر لە پشتەوەی شاشە دەتوانین ئەم هەنگاوانە بەکاربێنین:

سەرەتا دەچینە سەر قائمەی **Start** ئنجا دەچینە سەر **Seteng** ئنجا دەچینە سەر **Control Panel** وە لەوێ کلیکی لای چەپ دەکەین بۆ کردنەوەی ئنجا شێوەیێکمان بۆ دەردەکەوێ لەو شێوەیەدا دەچینە سەر **Display** وە دوو جار کلیکی لای چەپی لەسەر دەکەین

٢



تا شێوەیێکی ترمان بۆ دەردەکەوێ لە یەکەم بەشی شێوەکە کە **Background** دەچینە سەر بەشی خوارەوەی شێوەکە وە لە بۆشایکە ئەو وێنەیە هەڵدەبژێرین کە دەمانەوێ بۆ پشتەوەی روبەری شاشە دایبنێین ئنجا کلیك دەکەین لە سەر **OK** بۆ ئەنجام دانی کارەکە دەتوانین ئەم کارە هەر لە رێگای روبەری شاشەوە بکەین یەك جار کلیکی لای راست لە سەر روبەرەکە دەکەین هەمان شێوەی پێشومان بۆ دەردەکەوێ وە هەمان هەنگاوەکان بە کاردێنین بۆ گورینی وێنەی پشتەوەی روبەری شاشە .

# ٤- پاریزەری رووبەری شاشە Screen saver



**کاری ئەم بەشە تایبەتە بە پاریزەری شاشە کە بۆ ماوەییک دەتەوێ رووبەری شاشەکە بپاریزی. لەم بەشەدا باس لە چۆنیتی دانانی پاریزەری شاشە دەکەین .**

١



سەرەتا بۆ ئەنجام دانی ئەم کارە هەر لە سەر رووبەری شاشەدا وە لە بۆشاییکی سەر شاشەکەدا کلیکی لای راست دەکەین تا لیستەکەمان بۆ دەردەکەوێ ئنجا لەوێ Propertis هەلدەبژێرین وە کلیکی لای چەپی لەسەر دەکەین تا شێوەییکمان بۆ دەردەکەوێ لەو شێوەیەدا دەچینە سەر Screen saver وە کلیکی لای چەپی لەسەر دەکەین تا شێوەییکی ترمان بۆ دەردەکەوێ .

٢



دوای دەرکەوتنی شێوەکە دەچینە سەر ئەو بۆشاییەی کە دەکەویتە لای چەپی شێوەکە ئنجا کلیکی لای چەپ دەکەین لەسەر بۆشاییەکە تا لیستی بۆشاییەکەمان بۆ دەردەکەوێ، لەو لیستەدا چەند جورێك هەیە لە پارێزەری شاشە وە دەتوانین هەر یەکێك لەو جۆرانە هەلبژێرین وە کلیکی لای چەپی لەسەر بکەین، لەبەرامبەردا وە لەبۆشاییکی بچوك کە دەکەوێتە لای راستی شێوەکە کاتەکەی بۆ دیاری دەکەین ئنجا کلیك دەکەین لەسەر OK .

## ٥- گۆڕینی ڕەنگی ئایکونەکان Appearanca

کاری ئەم بەشە تایبەتە بە گۆڕینی ڕەنگ و شێوەی ئەو فایلانەی کە لە ناو ئامێرەکەدا هەن کە دەتوانین بە دوای ئەم هەنگاوانەدا بڕوین بۆ ئەنجام دانی گۆڕانکاریەکان.



سەرەتا بۆ ئەنجام دانی ئەم کارە پێویستە وەکو هەنگاوەکانی پێشوو لە سەر ڕووبەری شاشە کلیکی لای ڕاست بکەین وە لە لیستەکەدا Propertis هەڵبژێرین وە کلیکی لای چەپی لە سەر بکەین ئنجا شێوەییکمان بۆ دەردەکەوێ لەو شێوەیەدا دەچینە سەر Appearance وە کلیکی لای چەپی لەسەر دەکەین تا شێوەییکی ترمان بۆ دەردەکەوێ .

١



٢



دوای دەرکەوتنی شێوەی دووەم دەچینە سەر ئەو بۆشایەی کە لای چەپی شێوەکەدا هەیە بە ناوی Scheme وە لە بۆشایەکەدا جورەها شێوەو ڕەنگی تێدایە کە دەتوانین بۆ گورانکاریەکان بە کاریان بینین وە شێوەکانی فایلەکانی ویندۆسی پێ بگورین وە لە چوار گۆشە بچوکەکەی لای ڕاستی شێوەکە دەتوانین ئەو ڕەنگەی بمانەوێ بیگۆڕین .

## ٦- گۆڕینی قەبارەی ئایکونەکان Settings

کاری ئەم بەشە تایبەتە بە گۆڕینی قەبارەی ئەو ئایکونانەی کە دەکەونە سەر ڕووبەری شاشە و هەموو ئەو ڕەنگانەی کە ئامێرەکە دەیخوێنێتەوە.




سەرەتا بۆ ئەنجام دانی ئەم کارە دەبێ بچینە سەر قائمەی Start وە لەوێوە بچینە سەر Settings وە لەوێ دەچینە سەر Control Panel وە کلیکی لای چەپی لەسەر دەکەین بۆ کردنەوەی، ئنجا دەچینە سەر Display وە دوو جار کلیکی لای چەپی لەسەر دەکەین تا شێوەییکمان بۆ دەردەکەوێ لەو شێوەیەدا دەچینە سەر ئاخیر بەش هەڵدەبژێرین Settings یەک جار کلیکی لەسەر دەکەین تا شێوەیکی ترمان بۆ دەردەکەوێ .

١



٢




دوای دەرکەوتنی شێوەکە دەچینە سەر ئەو شێوە شریتەی کە بەناوی Screen area وە بە ئاراستەی ماوسەکە قەبارەی ئایکونەکان دەگۆڕین بەو شێوەیەی کە دەمانەوێ، لەبەرامبەر شریتەکە بۆشاییەك هەیە لەو بۆشاییەدا دەتوانین ڕەنگەکان هەڵبژێرین، دوای ئەنجام دانی ئەم گۆڕانکاریانە کلیك دەکەین لەسەر OK .

# ٧- دوگمەکانی ماوس Mouse

کاری ئەم بەشە تایبەتە بە گۆڕینی کلیکی لای راستی ماوسەکە بۆ کلیکی لای چەپی وە بە پێچەوانەشەوە، هەروەها دەتوانین خێرایی کلیکە لێرەدا زیاد و کەم بکەین.




سەرەتا بۆ ئەنجام دانی ئەم کارە هەمان هەنگاوی پێشوو دەنێین بۆ چوونە سەر Control Panel دوای دەرکەوتنی شێوەی Control Panel دەچینە سەر شێوەی ماوسەکە وە دوو جار کلیکی لای چەپی لەسەر دەکەین تا شێوەیێکمان بۆ دەردەکەوێ؛ ئنجا دەچینە سەر Buttons کە لەوێ دەتوانین کلیکی لای راست بکەین بە چەپ وە بە پێچەوانەشەوە دەتوانین چەپ بکەین بە راست بە هۆی ئەو دوو بۆشایە بازنەیی کە لەبەشی سەروە هەیە .

١



٢



وە هەروەها دەتوانین خێرایی کلیکەکە زیاد و کەم بکەین بە هۆی ئەو شریتەی کە لەبەشی خوارەوە هەیە کە بە ئاراستەی ماوسەکەوە دەتوانین ئەو شریتە بە لای راست و چەپ ببەین بۆ خێرا کردنی کلیکەکە بەو شێوەیەی کە خۆمان مەبەستمانە .

# ٨- شێوەی ئاراستەکە Pointers




کاری ئەم بەشە تایبەتە بە گۆڕینی شێوەی ئاراستەکە. بەم شێوازە دەتوانین ئاراستەکە بگۆڕین بە شێوەیێکی تر کە خۆمان هەمان لە ناو شێوەکان .

سەرەتا بۆ ئەنجام دانی ئەم کارەش هەر هەمان ڕێگا هەڵدەبژێرین بۆ چونە سەر Control Panel وە کلیك دەکەین بۆ کردنەوەی، ئنجا دەچینە سەر هەمان شێوە کە ماوسەکەیە وە لەوێ دوو جار کلیکی لای چەپی لەسەر دەکەین تا شێوەییکی ترمان بۆ دەردەکەوێ، لەو شێوەیەدا Pointers وە کلیکی لەسەر دەکەین تا ئەم شێوەیەمان بۆ دەردەکەوێ .

١



٢



دوای دەرکەوتنی شێوەی Pointers دەچینە سەر ئەو بۆشایەی کە شێوەکانی ئاراستەی تێدایە وە یەکێك لەو ئاراستانە هەڵدەبژێرین وە کلیکی لەسەر دەکەین بۆ دیاری کردنی ئنجا کلیك دەکەین لەسەر Save As بۆ پاراستنی ئنجا کلیك دەکەین لەسەر OK .

# ٩- جوڵەی ئاراستەکە Motion




کاری ئەم بەشە تایبەتە بە جوڵەی ئاراستەی ماوسەکە وە هەروەها بۆ دروست کردنی سێبەرێک بۆ ئاراستەکە کە لەم بەشە دەتوانین ئەم دوو کارە لە ڕێگای ئەم بەشەوە بکەین .

١



سەرەتا بۆ ئەنجام دانی ئەم کارە هەمان کار دەکەین بۆ چونە سەر Control Panel وە کلیکی لەسەر دەکەین بۆ کردنەوەی شێوەکە، ئنجا دەچینە سەر شێوەی ماوسەکە وە دوو جار کلیکی لای چەپی لەسەر دەکەین بۆ دەرکەوتنی شێوەکەی ئنجا لەو شێوەیە دەچینە سەر Motion وە لەوێ کلیک دەکەین تا شێوەییکمان بۆ دەردەکەوێ .

٢



دوای دەرکەوتنی شێوەی دووەم دەبینین کە دوو شریتمان هەیە لە ناو ئەو شێوەیە یەکەم شریت تایبەتە بە خێرایی ئاراستەی ماوسەکە وە دووەم شێوە تایبەتە بە دروست کردنی سێبەرێك بۆ ئاراستەی ماوسەکە ئەوانیش بەهۆی ئەم دوو شریتەوە دەبیت کە بە ڕاکیشانی شریتەکە دەتوانین ئاراستەکە خێرا بکەین وە ئەو چوار گۆشەکە دیاری بکەین بۆ دروست کردنی سێبەرەکە بۆ ئاراستەکە .

# وانەی نۆیەم

## ئامێری چاپ کردن Printers

### ١- ناساندنی ئامێری چاپکردن

چۆنێتی ناساندنی ئامێرێکی چاپ کردن  بە کۆمپیوتەرەکە

### ٢- تایبە تمەندیەکانی ئامێری چاپ کردنەکە

چۆنێتی زانینی تایبەتمەندیەکانی ئامێری چاپ کردنەکە

### ٣- زانینی هەڵەی ئامێری چاپ کردن

چۆنێتی زانینی هەڵەی ئامێری چاپ کردنەکە

### ٤- بەڕێوەبردنی چاپ کردنەکە

چۆنێتی زانینی و بەڕێوەبردنی چاپکردنەکە

### ٥- زانیاریەکانی چاپ کردن

چۆنێتی زانینی زانیاریەکانی چاپکردن

# ١- ناساندنی ئامێری چاپکردن

کاری ئەم بەشە تایبەتە بە چۆنێتی ناساندنی ئامێریکی چاپ کردن بە کۆمپیوتەرەکە کە بەم شێوازەی لای خوارەوە باسی دەکەین .



بۆ پێناسە کردنی ئامێریکی چاپکەر بەکۆمپیوتەرەکە دەبێ سەرەتا بچینە سەر لیستی **Start** وە لەوێ کلیکی لای چەپ بکەین بۆ کردنەوەی لیستەکە ئنجا بچینە سەر **Setting** وە لەوێ لیستێکی ترمان بۆ دەردەکەوێ دەچینە سەر **Printers** وە کلیکی لای چەپی لەسەر دەکەین بۆ کردنەوەی ئنجا شێوەیێکمان بۆدەردەکەوێ لەو شێوەیەدا ئەم بەشەی تێدایە **Add Printer** دوو جار کلیکی لای چەپی لەسەر دەکەین بۆ کردنەوەی .

١




دەبینین کە شێوەییکمان بۆ دەردەکەوێ لەو شێوەیەدا **Next** هەڵدەبژێرین وە کلیکی لەسەر دەکەین تا شێوەییکی ترمان بۆ دەردەکەوێ، ئنجا لە شێوەی دووەم ناوی ئەو کارگەیە هەڵدەبژێرین کە ئامێری چاپکەرەکەی دروست کردوە وە لە بەرامبەریشدا تایبەتمەندیەکانی واتا ( مواصفاتی ) ئامێرەکە هەڵدەبژێرین وە کلیک دەکەین لەسەر **Next** بەو شێوەیە تا کۆتایی کلیک دەکەین لەسەر **Next** وە لە کۆتاییدا کلیک دەکەین لەسەر **Finsh** بەو شێوەیە دەبینین کە ئامێرەکەمان بە کۆمپیوتەرەکە پێناسە کرد

٢



# ٢- تايبه تمەندیەكانی ئامێری چاپ كردنەكە



كاری ئەم بەشە تایبەتە بە چۆنیتی زانینی تایبەتمەندیەكانی ئامێری چاپكردن كە دەتوانی بەم هەنگاوانە بزانی تایبەتمەندیەكانی ئامێرەكە چیە.

بۆ زانین و چونە سەر تایبەتمەندیەكانی ئامێری چاپ كردن دەبێ سەرەتا بچینە سەر لیستی **Start** وە لەوێ كلیكی لای چەپ بكەین بۆ دەركەوتنی لیستەكە ئنجا بە هەمان شێوەی جاری پێشوو دەچینە سەر **Setting**، لەوێوە لیستیكی ترمان بۆ دەردەكەوێ لەو لیستەدا **Printer**، كلیكی لای چەپی لەسەر دەكەین بۆ كردنەوەی دەبینین ئێستا شێوەیێكی تر زیاد بووە لە تەنیشت **Add Printer** كە ئەویش دوای پێناسەی ئامێرەكە دروست دەبێ .

١



ئێمە لەم دوو شێوەیە شێوەی دووەم هەڵدەبژێرین واتا شێوەی ( طابعەكە ) وە كلیكی لای راستی لەسەر دەكەین تا لیستەكەمان بۆ دەركەوێ لەو لیستەدا **Properties** هەڵدەبژێرین وە كلیكی لای چەپی لەسەر دەكەین دەبینین كە شێوەیێكمان بۆ دەردەكەوێ كە كۆمەڵێ هەڵبژاردەی تێدایە، ئەو هەڵبژاردانە هەر یەكەی تایبەتمەندی بەشێكی تێدایە .

٢



# ٢- زانینی هەڵەی ئامێری چاپ کردن

کاری ئەم بەشە تایبەتە بە چۆنیێتی زانینی هەڵەی ئامێری چاپکردنەکە کە بە دوو شێوە دەتوانین ئەم کارە ئەنجام بدەین، لەم بەشەدا ئێمە باسی هەردوو شێوە دەکەین .



١




بۆ زانینی هەڵەی ئامێری چاپکردنەکە دەتوانین سەرەتا بچینە سەر لیستی **Start** وە لەوێ کلیکی لای چەپی لەسەر بکەین بۆ دەرکەوتنی لیستەکە ئنجا بەهەمان شێوەکانی پێشوو دەچینە سەر **Setting** وە لەویشەوە دەچینە سەر **Printer** وە کلیکی لەسەر دەکەین بۆ کردنەوەی، ئنجا دەچینە سەر شێوەی ( طابعەکە ) و کلیکی لای راستی لە سەر دەکەین تا شێوەیێکی ترمان بۆ دەردەکەوێ .

٢



لەو شێوەیەدا و لە بەشی خوارەوەی **General** دەبینین نوسینێك هەیە بە ناوی **Print Test Page** لەوێ و لەسەر ئەو نووسینە کلیك دەکەین دەبینین کە ئامێری چاپ کردنەکە لاپەڕەیێکمان بۆ رادەکێشی کە لەو لاپەرەیەدا ئەگەر نووسینەکە کاڵ بوو یان وێنەکە روون نەبوو ئەوە دەزانین کە هەڵە هەیە.

شێوەی دووەم هەر لەسەر ئامێری چاپ کردنەکە دوگمەی تێست هەیە دەتوانین ئەو دوگمەیە بۆ زانینی هەڵە بەکاربێنین .

# ٤- بەڕێوەبردنی چاپ کردنەکە

کاری ئەم بەشە تایبەتە بە چۆنیەتی زانین و بەڕێوەبردنی چاپ کردنەکە کە کاتێک لاپەڕەیێک دەنووسین و دەمانەوێ چاپی بکەین. لەم بەشەدا باسی ئەوە دەکەین .



بۆ ئەنجام دانی ئەم کارە دەبێ بچینە سەر بەرنامەی Word Pad چونکە ئەم بەرنامەیە هەر تایبەتە بە ویندۆس، بۆ چونە سەر ئەو بەرنامەیە سەرەتا دەچینە سەر لیستی Start وە کلیك دەکەین بۆ کردنەوەی لیستەکە ئنجا دەچینە سەر Program وە لەوێوە لیستێکی ترمان بۆ دەردەکەوێ، ئنجا دەچینە سەر Accessories وە لەوێشەوە دەچینە سەر بەرنامەی Word Pad وە کلیکی لەسەر دەکەین بۆ کردنەوەی .

١




دوای کردنەوەی بەرنامەی WordPad دەبینین کە ئەم بەرنامەیە تایبەتە بە شت نووسین وە شتێك یان هەندێك نووسین لە ناو ئەو لاپەڕەیە دەنووسین وە دوای گۆڕینی شێوەی نووسینەکە کە دەمانەوێ چاپی بکەین دەچینە سەر ئەو شریتەی کە لە بەشی سەرەوەی لاپەڕەکە هەیە وە کلیك لەسەر شێوەی ( طابعەکە ) دەکەین دەبینین کە وێنەی ( طابعەییك ) لە سەر شریتی مهام دروست دەبێت .

٢



# ٥- زانیاریەکانی چاپ کردن

کاری ئەم بەشە تایبەتە بە چۆنیتی زانینی زانیاریەکانی چاپ کردن، کە لەم بەشە دەتوانین ئەو لاپەڕانەی کە دەمانەوێ چاپی بکەین بەو شێوەیەی کە خۆمان مەبستمانە .



سەرەتا بۆ ئەنجام دانی ئەم کارە وە بۆ زانینی زانیاریەکانی چاپ کردن دەبێ سەرەتا بچینە سەر هەمان بەرنامەی پێشوو لە ڕێگای لیستی **Start** وە دەچینە سەر **Program** وە لەویشەوە دەچینە سەر **Accessories** وە لەوێ دەچینە سەر بەرنامەی **Word Pad** وە کلیکی لەسەر دەکەین بۆ کردنەوەی بەرنامەکە لە لاپەڕەیێکی بەرنامەکە دەبێ هەندێ نووسین بنوسین بۆ ئەوەی بتوانین چاپی بکەین .

١



ئنجا دوای ئەوەی کە لە نووسین تەواو دەبین وە دەمانەوێ کە چاپی بکەین دەچینە سەر لیستی **File** وە لەوێ کلیک دەکەین بۆ کردنەوەی لیستەکە ئنجا دەچینە سەر **Print** یان هەر بە کلیلەکانی سەر کیبۆرد بە کلیلی **Ctrl +P** دەتوانین کلیکی لەسەر بکەین دەبینین کە شێوەیێکی ترمان بۆ دەردەکەوێ لەو شێوەیەدا ئەگەر کۆمەڵێ لاپەرەت لەبەر دەست دابوو ئەوە **All** هەڵبژێرە، ئەگەر تەنها یەك لاپەرە بوو ئەوە ١-١ بنووسە، لەبەرامبەردا ژمارەی ئەو لاپەرانە دیاری بکە کە دەتەوێ چەند نسخەت بۆ رابکێشێ، ئنجا کلیك بکە لەسەر **OK** .

٢



# وانەی دەیەم
# Accessories

١- بەشەکانی ماڵتی میدیا Multimedia

چۆنیێتی بەکار هێنانی بەشەکانی دەنگ ورەنگ

٢- بەشی ژمێریاری Calculator

چۆنیێتی بەکارهێنانی ئامێری ژمێریاری

٣- بەرنامەی نۆت پاد Notepad

چۆنیێتی بەکارهێنانی بەرنامەی نۆت پاد

٤- بەرنامەی وێنەکێشان Paint

چۆنیێتی بەکارهێنانی بەرنامەی وێنە کیشان

٥- بەرنامەی ۆورد پاد wordpad

چۆنیێتی بەکارهێنانی بەرنامەی وورد پاد

٦-بەشەکانی یاری کردن Games

چۆنیێتی بە کارهێنانی بەشەکانی یاری کردن

# ١- بەشەکانی مالتی میدیا Multimedia



کاری ئەم بەشە تایبەتە بە ئەو بەشانەی کە CD دەنگ یان دەنگ و رەنگی پێ دەخوێنرێتەوە، لەم بەشەدا باسی ئەوە دەکەین کە چون CDدەنگ یان دەنگ و رەنگ بەکار بهێنین .

١



سەرەتا دەتوانین بۆ بەکارهێنانی CDیەکی دەنگ CD یەکە دابنێینە شوێنی تایبەتی خۆی لە ناو کەیسەکەدا، ئنجا دوای ئەوە وەکو هەنگاوی یەکەم دەچینە سەر لیستی Start وە لەوێوە دەچینە سەر Programs دوای ئەوە دەچینە سەر Accessories ئنجا دەچینە سەر Enter tainment دوای ئەوە دەچینە سەر ئەو بەشەی تایبەتە بە خوێندنەوەی CDدەنگ کە ئەویش CD Player ـە وە کلیکی لای چەپی لە سەر دەکەین بۆ کردنەوەی، ئنجا کار بە CD دەنگیەکە دەکەین .

٢



هەنگاوی دووەم بۆ بەکارهێنانی CD دەنگ و رەنگە کە ئەویش بەم شێوەیە دەبێت هەمان کارەکانی پێشوو دەکەین تا دەگەینە سەر Enter tainment، دوای ئەوە دەچینە سەر Media Player و کلیکی لە سەر دەکەین تا ئەم بەشەمان بۆ دەبێتەوە، ئنجا لیستی File دەکەینەوە و دەچینە سەر Open و لەوێشەوە بۆ سەر بەشە CDیەکە و ئەو بەشە دەنگ و رەنگیە دیاری دەکەین ئنجا بۆ نیشاندانی کلیك لەسەر Open دەکەین .

# ٢- بەشی ژمێریاری Calculator



کاری ئەم بەشە تایبەتە بە ژمێریاری و ژماردنی ئەو بەشە حیسابییەی کە خۆت دەتەوێ بە ئەنجامی بگەیەنیت واتا ئەم بەشە ناسراوە بە ( حاسبە ).

١



سەرەتا بۆ گەیشتن بەم بەشەو کار پێکردنی دەتوانین سەرەتا بچینە سەر لیستی Start وە لەویوە بچینە سەر Program وە لەوێوە بچینە سەر Accessories وە لەوێوە دەچینە سەر ئەو بەشەی تایبەتە بە ( حاسبە ) و بۆ کار پێکردنی ئەم بەشە ئەم هەنگاوەی لای خوارەوە بە کار دەهێنین .

٢



دوای ئەوەی کە چوینە سەر Accessories ئنجا دەچینە سەر Calculator وە لەوێ یەك جار کلیکی لای چەپی لەسەر دەکەین دەبینین ئەو شێوەیەمان بۆ دەردەکەوێ کە لە وێنەی بەرامبەردا دیارە دەتوانین ئەو ژمارانەی کە دەمانەوی بە کیبۆرد بینوسین و کارە حیسابیەکانی پێ بکەین وە هەروەها دەتوانین بە ماوس ئەم کارە ئەنجام بدەین .

# ٣- بەرنامەی نۆت پاد Notepad

کاری ئەم بەشە تایبەتە تۆمارگەی بیرەوەری ، یان تۆمارگەی یادوەری( مخزن مفكرة ) واتا لەم بەشە دەتوانین شتێک تۆمار بکەین و لەهەمان کاتدا بیپارێزین لە ناو هاردی ئامێرەکە .



١



سەرەتا وەکوو هەنگاوی یەکەم بۆ ئەم کارە دەتوانین بە هەمان شێوەی کارەکانی پێشوو بچینە سەر لیستی Start و لەوێوە بچینە سەر Program وە لەوێوە بچینە سەر Accessories وە لەوێوە بچینە سەر ئەو بەشە تایبەتیەی کە بەرنامەی Notepadـە، وە لەوێ یەك جار کلیکی لای چەپی لە سەر دەکەین بۆ دەرکەوتنی بەرنامەکە .

٢



دوای دەرکەوتنی بەرنامە دەتوانین ئەو نووسینانەی کە خۆمان مەبەستمانە بینووسین و بەو شێوەیەی کە خۆمان دەمانەوی بۆ ئەوەی ئەو نووسینانە بمێنێتەوە لە ناو هاردی ئامێرەکە دەتوانی بیپارێزی بەم شێوەیە دوای نوسینەکە دەچیتە سەر لیستی File وە لەوێ کلیك دەکەی، ئنجا دەچیتە سەر save as وە کلیکی لەسەر دەکەیت بە ناوێکەوە ( حفظ ) بکە تا لە ناو ئامێرەکە بمێنێتەوە .

# ٤-بەرنامەی وێنەکێشان Paint



کاری ئەم بەشە تایبەتە بە وێنەکێشان کە لەم بەشەدا دەتوانین وێنە بکێشین بەو شێوەیەی خۆمان دەمانەوێ واتا ئەم بەرنامەیە بە بەرنامەی وێنە کێشان ناسراوە ( برنامج الرسام )

سەرەتا بۆ هێنانی ئەم بەرنامەیە بۆ سەر رووبەری شاشە و کار لە سەر کردنی دەتوانین بە هەمان شێوە سەرەتا بچینە سەر لیستی Start دوای ئەوە دەچینە سەر Program ئنجا دوای ئەوە دەچینە سەر accessoriesئنجا دەچینە سەر ئەو بەشە تایبەتەی کە بەرنامەی وێنە کێشان ( برنامج الرسام )ە وە کلیکی لای چەپی لە سەر دەکەین .

١



٢



دوای کلیک کردن لەسەر بەرنامەی وێنە کێشان ئەم شێوەیەمان بۆ دەردەکەوێ کە لە وێنەی بەرامبەر دا دیارە دەتوانین بە ئاراستەی ماوسەکە ئەو شێوانەی کە لە شریتی وێنەکەدا هەیە بەکاریان بێنین وە ئەو شێوازە دروست بکەین کە خۆمان دەمانەوێ وە هەروەها ئەو رەنگانەی کە لە سەر شریتی رەنگەکانە دەتوانین بیان گۆرین بەو شێوەیەی کە خۆمان مەبەستمانە .

# ٥- بەرنامەی وۆرد پاد wordpad

کاری ئەم بەشە تایبەتە بە نووسین کە لەم بەشەدا دەتوانین هەر نووسینێک بمانەوێت بینووسین وە جۆری نوسینەکە لە عەرەبیەوە بگۆڕین بۆ کوردی یان بۆ ئینگلیزی واتا ئەم بەشە هاو شێوەیە لەگەڵ بەرنامەی وورد .



١



سەرەتا بۆ هێنان و کار کردن لەسەر ئەم بەرنامەیە دەتوانین ئەم هەنگاوانەی لای خوارەوە بنێن سەرەتا دەچینە سەر لیستی Start دوای ئەوە دەچینە سەر Program ئنجا دوای ئەوە دەچینە سەر Accessories وە لەوێشەوە دەچینە سەر بەرنامەی وورد پاد wordpad ئنجا لەوێ یەك جار کلیکی لای چەپی لە سەر دەکەین بۆ کردنەوەی بەرنامەکە .

٢




دوای کردنەوەی بەرنامەکە دەتوانین بە ئارەزوی خۆمان هەر نووسنێك بمانەوێت بینووسین وە بەو شێوەیەی کە خۆمان بمانەوێت دەست کاری نووسینەکە بکەین واتا دەتوانین شێوەی نووسینەکە ( فۆنت ) بگۆڕین وە هەروەها گەورە کردنی نووسینەکە و بچوك کردنی و دانانی خەت و ڕێکخستنی و کۆمەڵی شتی تر کە لە ناو ئەم بەرنامەیە هەیە .

# ٦- بەشەکانی یاری کردن Games



کاری ئەم بەشە تایبەتە بە ئەو یاریانەی کە لە ناو سیستەمی ویندۆس دا هەیە واتا ئەم بەشە چەند یاریەکی تێدایە کە بۆ وەخت بە سەر بردن دەتوانی سوودی لێ وەربگریت واتا ئەم بەشە تایبەتە بە یاری .

سەرەتا بۆ ئەوەی بتوانین بە شێوەیەکی ئاسان بچینە سەر ئەم بەشە وە ئەو یاریە هەڵبژێرین کە دەمانەوێت بیکەین دەتوانین ئەم هەنگاوانە بنێین سەرەتا دەچینە سەر لیستی Start دوای ئەوە دەچینە سەر program ئنجا دوای ئەوە دەچینە سەر Accessories وە لەوێشەوە دەچینە سەر بەشی تایبەتی بە یاری کە ئەویش Games ئنجا لەوی یەك جار کلیکی لای چەپی لەسەر دەکەین .

١



٢



دوای کلیك کردن لە سەر Games دەبینین لیستێکمان بۆ دەردەکەوێ لەو لیستەدا چەند یاریەکی تێدایە کە ئەو یاریانەش جۆرا و جۆرن واتا هەر یەکەی بە شێوەیەك یاری پێ دەکرێت دەتوانی یەکێك لەوانەی ناو لیستەکە هەڵبژێری و کلیکی لە سەر بکەیت تا بۆت دێتە سەر روبەری شاشە و لەوێ یاری پێ دەکەیت